- وایماڵی باوکت کاول بێت کە جوانی! بە ڕاست ئەم کچە کێیە؟
- پەنا بە خوا ئەمە چییە! ئەڵێی خوا بە قوربانی بم بە قەڵەم دروستی کردووە!
- کورە هەتیو بۆ کوێ ئەچیت، تۆ جارێ وەرە سەیرکە خوا چیی دروست کردووە، ئینجا بڵێ ئیشم هەیە!

ئەم قسەوباسانە و گەلێ قسەی زیاتریش لەو شوێنە ئەکران و ئەبیستران کە خونچەی لێ بوایە.

خونچە هەر بە ڕاستی وەک خونچە گوڵ وا بوو، خەڵک نەیدەزانی سەیری کوێی بکات. قەدوبالا، یان سەروپرچ، یان دەموچاو و ڕوومەتی پەڕەی گوڵی، یان دەمودان و لێوی ئاڵ و قوڵپی؛ یەک لە یەک جوانتر. جوانیی ڕاستی، بێ دەستکاری و بێ ڕەنگ و بێ قەڵەمی دەستکرد و بێ غەلوغەش؛ جوانیی خوایی.

خونچە نەک هەر لە گەڕەکی خۆیان ناوی دەرکردبوو، بگرە لە هەموو شارەکەشدا ناوی بەسەر زمانانەوە بوو. ئەوەی ئەوەندەی تر جوانتری کردبوو، حەیاوحورمەتەکەی بوو، ئەو تارمایی شەرم و شکۆیە بوو کە لە چاوە گەشەکانیدا دەرئەکەوت و دەموچاوی سوور

هەڵدەگیرا و تەریق ئەبووەوە وەختێ گوێی لە مەدحی خۆی ببوایە، یـان هەسـتی بکـردایە کەوا سـەیری ئەو ئەکەن و چرپەچـرپ ئەکەن. لەبەر ئەوە هەمیشە خوازبێنیکەری بەڕێوە بوون. بگرە لەوسایەشـەوە کە هێشـتا منـاڵ بـوو و لە کۆڵان یـاریی ئەکـرد و شـووکردن و شـتی وای لا یـاری و چاوشـارکێی منـاڵان بـوو. خـۆ کە عـومری بـوو بە شـازدە حەڤدە سـاڵ، ئیتـر پیـر و گەنـج، دەوڵەمەنـد و فەقیـر، جـوان و ناشـیرین هەر بەڕێـوە بـوون ئەهـاتن داوایـن ئەکـرد و مـاڵی باوکیـان هەراسـان کردبـوو. خـونچە زۆر جـار بێـزار ئەبـوو، بە هەفـتە و دوو هەفـتە نەئەچـووە دەرێ. بە تـایبەتی بـۆ حەمـامی ناوبـازاڕ، چـونکە خۆیان حەمامی وایان نەبوو کە خەڵک بیتوانیایە خۆی تیا بشتایە بێ ئەوەی سەرمای ببێ، بە تایبەتی زستانان. ئەوەندەی پێ نەچوو دەنگ بڵاوە بووەوە کە خـونچە درا بە شـوو و پـرس و پرسـیار دەسـتی پێ کرد.

زۆر کەس بە پەرۆشەوە و بە هەڵەداوان چوون بـزانن ئەمە کێیە، ئەو بەختیارەی خونچەی پێ ڕازی بووە و بوو بە نسیبی.

ئـاخری زۆری پـێ نەچـوو و زانـرا کە خـونچە دراوە بە حـاجی عەلـی سەرکارێزی. هەموو خەڵکەکە سـەریان سـووڕما، هەنـدێ وەخـت بـوو شەق بەرن لە داخاندا و هیی تر بە میراتی حاجییـان خسـت و هیـی وا هەبوو هەر دەست بدا بە یەکدا و سـەری ڕاوەشـێنێ و بڵـێ وای پێـی حەرام بێت و ئەوی دیکەش ئەیگوت هەی عەمری دایکوباوکی نەمێنێ، ئەو کچە نازدارەیان چۆن فرۆشت بەو پیرەمێردە کەوڵەکۆنە! دە سـاڵ لە باوکی گەورەترە! کوڕە پارەی حاجی چاوی کوێر کردن چاویـان لە پیری و گەنجی نەما.

ئیتر قسە و قسـەرۆک بڵاو بوونەوە بە نـاو خەڵکدا و تـا بەینێکـی زۆر ئەم شووکردن و ژنهێنانە بـوو بە بنێشـتە خۆشـەی ژێـر دانـی خەڵکـی شــار. خــونچە گــوێزرایەوە بــۆ حــاجی، لەگەڵ ئەو هەمــوو قســە و قسەرۆک و سەر سووڕمانە و هەرچی هەبوو.

حاجییش وەکو بیەوێت ئەوەندەی تر دیقەدیقەی خەڵکی بدات، چوو ئەوەندەی ئاڵتوون و جلی جوان و ناومالّی چاکی بۆ کرد، هەر بە جارێک خونچەی نوقمی خێر و خۆشی کرد.
ئەو ئەیگوت ئەوە بۆیە وای بۆ ئەکات تا دڵی ڕازی کات. ئەڵێن خۆی ڕازی نەبووە و خەریک بووە خۆی بکوژێت. ئەوی تر دەیگوت باوکی ئەوەندە قەرزار بوو، حاجی هەموو قەرزەکانی بۆ داوەتەوە و خانوویەکیشی داوەتێ. ئەم دەیگوت بابە قەت باوەڕ ناکەم ئەم ژنهێنانە سەربگرێت. ئاخر ئەم فەقیرە عومری ١٨ ساڵە و پیاوەکە ٦٥، ئەڵێن ١٠ ساڵ لە باوکی گەورەترە. ئیتر دەمە و لە چیت کەمە. تا ماوەیەکی زۆریش کە هەموو شتێک بڕابووەوە و کچەکە لە ماڵی خۆی دانیشتبوو، هێشتا خەڵک هەر وازی نەئەهێنا لە بەیت و بالوورە و حەسوودی و بەخیلی بە حاجی عەلی.
خونچە بەرە بەرە خەریک ئەبوو بە ژیانی تازەی ڕائەهات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زوو زوو دڵی پڕ ئەبوو و بیری دایک و باوک و خوشک و براکانی ئەکرد. بۆیە زۆر جار ئەچوو بۆ لایان و دایک و کەسی بەڕێوە بوون و سەریان ئەدا. بۆیەش دڵی تەنگ ئەبوو، چونکە فێری خێزانی قەڵەباڵغ و خوشک و برای زۆر بوو. فێری قڕەقڕ و دەنگەدەنگ و شەڕەشەقی مناڵە وردکە و هاتوهاواری دایکی بوو بە دەستیانەوە، لەپڕ خۆی بینی بە تەنیایی لە خانوویەکی خۆش و ڕازاوە بە فەرش و قاڵی و کەلوپەلی چاک و خۆشی نوقمی ئاڵتون و سورمە و تورمەی جوان، بەڵام هەموو ئەمانە دوای چەند ڕۆژێک و دوای ڕەوینەوەی خەڵکی دەوروپشتی بە کەڵکی نەهاتن و هیچ نەیتوانی کاری تێبکات کە ئەوەندە بێتاقەت نەبێت.
هەرچەندە گیانێکی بە ماڵی وەستا قادری دراوسێیان بوو، چونکە ئەوانیش خێزانێکی زۆر بوون و هەروەها هەمیشە بە دەنگیەوە ئەچوون، بە تایبەتی ئەحمەدی کوڕیان کە وردیلکە بوو و خونچە ئەینارده بازار و ئەملا و ئەولا کە ورده شتی بۆ بکڕێت. تێکڕا کە

ئەحمەدیش ئەگەڕایەوە لە مەکتەب، هەر زوو کتێبەکانی دائەنا و بە هەڵەداوان ڕای دەکردە لای خونچە کە بزانێ هیچ ئیشی نییە. خونچەش زۆر دڵی پێیان خۆش بوو، بە تایبەتی کە حەباوەخانی دایکیان زۆر ژنێکی دڵسۆز و چاک بوو.

گەلێ جار بۆ خونچەی ئەگێڕایەوە کە چەند لە دەمێ ساڵەوە لەگەڵ حاجی عەلی دراوسێن و هەر پێکەوەن تاکو ئێستە و هەمیشە وەک یەک ماڵن و چۆن وەستا قادر ئەو هەموو ساڵە دڵسۆز وەکیل و کلیل بە دەستی حاجیە. خۆ ڕەعناخانی خوشکی حاجی ئەوە هەر هیچ باس ناکرێت، کە لەگەڵ حەبێخاندا چەند ڕۆحیان بەسەر یەکەوەیە، بە تایبەتی کە ئەحمەدیش بە شیری ڕەعناخان گەورە بووە، حەبەخان ئەیکرد بە گاڵتە و پێکەنین و باسی کۆن و تازەی بۆ خونچە ئەگێرایەوە و ئەیگوت کە هەندێ جار لە ئەحمەد تووڕە ئەبم، ئیتر خۆت ئەزانی منداڵ چەند بەزمی هەیە، یەکسەر ڕائەکات و ئەڵێت وەڵا ئێستە ئەچم بە دایە ڕەعنا ئەڵێم، کە ئەچێت شکاتم لێ ئەکات، ئەویش دێتە سەرم شرت و شۆم لێ ئەبڕێت. حەبەخان ئەکەوت بە گازی پشتا و ئەیگوت خوا نەکا جارێک لە دەستم دەربچێت و مستەکۆڵەیەک لە ئەحمەد بدەم بە خوا دێتە سەرم لەجیاتیی مستەکۆڵەیەک، دەم لێ ئەدات و ئەڵێت ئەوە لەجیاتیی کوڕەکەم، ئەوە چۆنت دڵ دێت پیائەکێشی.

ئەحمەدیش کە لە مەکتەب ئەگەڕایەوە و سەری خونچەی ئەدا دائەنیشت باسی مەکتەبی بۆ ئەگێڕایەوە، کە ئیمڕۆ چی قەوماوە و کێ داری خواردووە، موعەلیم کێی هەڵساندووە بۆ سەر تەختە کەچی دەمی پڕ بووە لە خواردن. مامۆستا لاڵەپەتەکە ئیمڕۆ چیی وتووە و لە حەوشەی مەکتەب کێ و کێ لاساییان کردووەتەوە. ئیتر لەم جۆرە قسانەی بۆ ئەکرد، خونجەش دەمی دائەپۆشی بە لکی سەرپۆشەکەی و ئەیدایە قاقای پێکەنین و فرمێسک لە چاوی دەرئەپڕی و کە ئەهاتەوە سەرخۆ، ئەویش ئەکەوتە باسی ماڵی خۆیان و کە خوشک

و براکــانی چــۆن شــەڕ ئەکەن و چــۆن برایەکــی پیســوپۆخڵێ هەیە هەمیشــە دایکــی هــاواریەتی لە دەســتی و کــوڕەکە گەورەشــە و لە متەوەسـیتەیە، کەچـی وایە و ئەو ڕۆژەی بینێرین بـۆ حەمـام هەرچـی دەرودراوسـێ و گەڕەک هەیە ئەزانـن کە ئەمە کـاوە بە خێـرێ ئەبـێ خۆی بشوات و ئەوە ئەیانەوێ بینرێن بۆ حەمـام. بە پێچەوانەی ئەو، برایەکـــی گەورەتـــری هەیە، ئەو شـــەو و ڕۆژ لەبەر ئـــاوێنەیە و مووکێشـی بە دەسـتەوەیە و خەریکـی خـۆیەتی. نـابێ خەتـی پرچـی وابێت و نابێ قەدی جلەکانی تێک بچێت و هەمیشە دوو دەسـڕی لە گیرفانـدایە، یەکـێ بـۆ دەسـت و دەموچـاوی و یەکێکی بـۆ سـڕینەوەی قۆندەرەکانی، کە ئەبێ وەک تازە بریقەیان بێت. ئەحمەدیش کە گوێی لەو قسـانە ئەبـوو، خـۆی ئەبوورانـدەوە و هەڵـدەپەڕی و هەڵـدەبەزی لەبەر پێکەنین. گەلی جار کە خونچە بە تەنیـا ئەبـوو، بیرێکی لە خـۆی ئەکردەوە و دەستی ئەدا بە یەکدا و پێئەکەنی و ئەیگوت ئەیەڕۆ چـۆن ئەقڵـی خـۆمم خسـتووەتە ئەقڵـی ئەم منـاڵە دە سـاڵەوە، سـەیرکە چـۆن دائەنیشـین و حکـایەت بـۆ یەکتـر ئەگێـڕینەوە. هەروا مانـگ و سـاڵ تێـئەپەڕین یەک لە دوای یەک، خـونچەش هەروەک خـۆی حەپـس و دیلی ئـاڵتوون و مرواری و وسـورمەی چـاک بـوو. تـا ئەهـات جـوانتر ئەبوو و وەک میوەیەکی گەییوی نایاب چاوەڕێی دەسـتێکی ئەکـرد کە بیکاتەوە، بەڵام ئەو دەستەی ئەو هەیبوو زۆر دەسـتێکی بێهێز و بێتین و ساردوسـڕ بـوو. لەگەڵ ئەو هەمـوو کـولان و هەڵچـوون و گەرمەی هەرزەکـاری و هەڕەتـی جـوانیی ئەمـدا قەت نەئەگونجـا. هەرچەنـدە خونچە وەک هەمیشەی خۆی بە تەنگ ئابڕوو و حەیاتی خـۆیەوە بـوو و هـەروەها زۆر حـورمەتی ئەو پەیوەندییەی ئەگـرت کە لە بەینـی ئەو و مێردەکەیـــدا هەبـــوو و بە هەمـــوو هێـــز و توانـــای خـــۆیەوە ئەو پەیوەندییەی ئەپاراست و ئەوانەی لە گۆمی قوڕاویدا بـۆ شـت و قسـە و قســەرۆک ئەگەڕان، زۆر تەریـق ئەکـردەوە و وای لـێ ئەکـردن کە

دەست بخەنە سەر دەست و بر هەڵبرن بۆ سەرەوە و لچ و لێویان هەڵقورتێنن و سەدەق لە کاری خوا بکەن.
بەڵام تەنیا ئارەزوویەک ئەهات بە خەیاڵی خونچەدا ئەوە بوو کە چەند خۆش ئەبوو ئەگەر هیچ نەبێت منالێکی ئێسک سووکی هەبوایە و بیتوانیایە لەگەڵی ڕایبواردایە و خۆی پێوە خەریک کردایە. بە تایبەتی کە ئارەزووی دایکێتی زۆری بۆ ئەهێنا و هەمیشە هانی ئەدا و بانگی ئەکرد. مانگ و ساڵیش هەر وا بە پەلە تێئەپەڕین بێ ئەوەی پرس بە کەس بکەن یان شەرم لە کەس بکەن. بەیانییەکی جومعە ئەحمەد بە ڕاکردکن خۆی کرد بە ماڵی مامە عەلیدا و وەکو بانگی ئەکرد، شڵەژابوو و سوور هەڵگەڕابوو و دڵی خۆش بوو و هەموو لەشی پێئەکەنی و پاڵی بە دەرگاکانەوە نا و ئەم ژوور و ئەو ژووری کرد و گوتی مامە گیان، بە خوا ئیشێکی زۆر چاکم بۆ پەیا بوو. خونچەش هات بەسەرا و خۆی و حاجیی مێردی ڕاپەڕین و دڵیان خۆش بوو و گوتیان ئادەی بڵێ بزانین چییە؟
ئەحمەد دەسرەکەی دەرهێنا و دەموچاوی خۆی سڕییەوە و بە خۆشییەکەوە گوتی ئیمشەو خاڵە مچەی خزمی باوکم لە کەرکووکەوە هاتبووە ماڵی ئێمە و بە باوکی گوت کەوا پیر بووە و پەکی کەوتووە و تاقەتی نەماوە و پێویستی بە دڵسۆزێکە و گوتی ئەمەوێت ئەحمەد بەرم بۆ کەرکووک دایمەزرێنم لای خۆم و هەموو ئیشوکاری مسافرخانەکەمی بدەمە دەست، بە تایبەتی کە شەشی سانەوییشی تەواو کردووە.
حاجی عەلی گوتی یاخوا ڕۆڵە خێری دونیا بەسەرتا دابارێت، وەڵائەمە هەر قابیلی خۆتە ئەشەهەدوبیللا ئیشێکی زۆر چاکە، ئەگەرچی زۆریشت بیر ئەکەین، بەڵام قەیناکە ئەمەتا کەرکووک، نزیکە، زوو زوو سەرمان ئەدەیت و ئێمەش هەمیشە ڕێمان تێئەکەوێت، ئینجا وا زوو ئۆغر ئەکەیت؟ ئەحمەد گوتی وەڵا مامە گیان ڕەنگە هەر ئەم ئێوارەیە بڕۆین، چونکە خاڵە مچە ئەڵێت کەوا

ئیشـــەکانی مســـافرخانەکەی هەر وا بەڕەڵان بە دەســـت شـــاگردەوە و ئەڵێت ئەگەرچی هەموویـان کـوڕی باشـن، بەڵام هەر حەز ئەکات زوو بگەڕێتەوە.
خـونچەش بە شـەوق و خۆشـییەوە گـوتی ئۆخەی ئەحە گیـان یـاخوا خۆشیی دونیات بەسەرتدا داباریێت. بەڵام بە ڕاستی جێت خاڵی ئەبێت و زۆرت بیر ئەکەین. خونچە بە زەردەخەنەیەکی شـیرینەوە سـەیرێکی ئەحمەدی کرد و گوتی زوو زوو بێیتەوە ها، نەچیت و ئیتر ئێمەت بیر نەمێنێ. ئەحمەد گوتی چۆن؟ تۆبڵێی؟ بە خـوا زوو زوو خـۆم لە خـاڵە مچە ئەدزمەوە و دێمەوە بۆ لاتان.
حاجی عەلی گوتی ئەی ئەو کافرە بۆ نەهات سەرێکمان بدات.
ئەحمەد گوتی چۆن خاڵە، گوتی هەر ئێستە دێتە خزمەتت بە تـایبەتی کە زانیـی خـوانەکەردە ناسـاغی. لەم قسـانەدا بـوون کە خـاڵە مـچە بە گـرم و هـوور و قاقـای پێکەنـین و کۆکە کۆک کـردی بە مـاڵا. هەمـوو هەسـتان بـۆ بەخێرهـاتن و لەگەڵ حـاجی دەسـتیان کـردە ملـی یەک و چاک و چۆنیی گەرمی لەگەڵ خونچە کرد و چەنـد ماشـەڵای لـێ کـرد. دوو سـێ نـوکتە و لە قسـە خۆشـەکانی بە حـاجی عەلـی گـوت و یەک دوو مستەکۆڵەی گاڵتەی بە حاجیدا دا و چەند توانجێکی تێگرت.
حاجی عەلی بە پێکەنین و گەرمییەوە ڕووی کردە خـاڵە مـچە و گـوتی ماڵت کاول بێت، جارێ هەناسەیەکی بدە، پشـوویەک بـدە. ئەوە هـیلاک نەبووی، تۆزێ لەسـەرخۆ، جارێ وەرە دانیشە بزانین چی ئەخۆیتەوە. خونچە چایەکەی حازر بوو، گورج خەریکی پیاڵەکانی بـوو و چـایەکی جـوانی بـۆ خـاڵە تێکـرد و ئەحـمەد خسـتیە بەردەمـی. حـاجی عەلـی بە پەرۆشەوە گوتی هەی کافر ئەوە هاتووی ئەحە بەریت، ئەی ئێمە چـی بکەیـن؟ ئەوە چـۆن حەبەخانـت ڕازی کـرد. خـۆ ئەو ئەگەر ئەحـمەد ســەعاتێک لە شـــوێنێک دوا کەوێــت عەبــا ئەدا بە ســـەریدا و شـــار سەرەوژێر ئەکات تا بزانێت بۆ دوا کەوتووە. ئەحمەد پێکەنیی و گوتی وەڵا مـامە گیان ڕاست ئەفەرموی، جومعەی پێشـوو لەگەڵ یەک دوو

هاوڕێم چووم بۆ چەمچەماڵ بۆ سەر شایی کوڕێکی ناسیاومان، کەچی باوکم گوتی ئەو شەوە دایکت نەیهێشتووە کەسمان بنوین. هەر دانیشتووە و پاڵ کەوتووە و ڕاپەڕیوە و هەستاوەتەوە و هەزار دوعای لە خۆی کردووە و گوتوویەتی ملم بشکێ ئەوە بۆ هێشتم بڕوات لەگەڵ ئەو هەتیو و مەتیوانە و هەر هاتووە و چووە و جنێوی بە خۆی بە هاوڕێکانم داوە، کە بۆچی بردوویانم و هەر منداڵی بەسەزمانی داپلۆسیوە لە تاواندا. ئیتر ماڵەکەی شیواندبوو تاکو هاتبوومەوە. حاجی عەلییش گوتی ئاخ منیش وا ئەڵێم باوەڕ ناکەم حەبەخان بتوانێت هەڵبکات.

خاڵە مچە قاقایەکی بەرزی لێ دا و بە هەناسەبڕکێوە گوتی خەمتان نەبێت بە سەری هەموومان ئێستە وا فێر ئەبێت نەبێتەوە. زۆر کەس وایان کردووە و لەویش خراپتریان کردووە، دوایی ڕاهاتوون، دەردی مەسەلەکە گوتەنی ئینسان زاڵمە. دواینیوەڕۆ خاڵە مچە لە قەمەرە دابەزی و لە دەرکی حەوشەوە سەرێکی کێشا و هاوارێکی ئەحمەدی کرد و گوتی ئەحمەد گیان حازری؟ دەی خێراکە باوکم درەنگە. ئەحمەد بە هەڵەداوان هات و جانتایەکی بە دەستەوە، دایک و باوک و خوشک و برای بە دواوە بوون. پووری بە چاوی پڕ فرمێسکەوە خەریکی ئایەتەلکورسی و دوعا خوێندن و فووکردن بوو. خوشکە گەورەکەی بە جامە ئاوەوە بە ماتی ڕاوەستا تا کە ئوتومبیلەکە کەوتە ڕێ، ئاوەکەی بە دواوە بڕێژێ. باوکی شپرزە و مات ببوو.

خاڵە مچە سەیرێکی کرد و دەستێکی لە پشتی ئەحمەد دا و گوتی بڕۆ باوکەکەم سوار بە. گوێ مەدەرە گریانی ئەمان و ڕووی کردە جەماعەت و گوتی ئەوە چیتانە ئەڵێی کوڕەکە ئەچێت بۆ حەرب و غەزا. کوڕە باوکم وازی لێ بێنن، کوڕەکە شکور گەورە بووە و پیاوە لێی گەڕین با بڕوا بە خۆی بگات، ئەمەی بۆ چییە!

خاڵە مچە و ئەحمەد لە پشتی قەمەرەکە سوار بوون لەگەڵ پیاوێکی تریش کە هەر لە پشتەوە دانیشتبوو، بوون بە سێ کەس و

کـابرایەکیش لە پێشــەوە لەگەڵ ئوتــومبیلچییەکە دانیشــتبوو. ئیتــر بە هەموویـــــان خواحافیزییـــــان کـــــرد و قەمەرەکە کەوتە ڕێ بەرەو کەرکووک. لە شار دەرچوون و تاکو گەیشتنە دەوروبەری قلیاسـان و باخی بەختیاری، ئەحمەد هەر مـات و بێدەنگ و نـاڕەحەت دیار بـوو. خاڵە مچە کەوتە قسەکردن لەگەڵی و دڵدانەوەی و گوتی کوڕم بۆ وا ماتی، گوێ مەدەرێ ئێستە تۆیش ڕادێیت و ئەوانیش ڕادێن، خۆ منـاڵ نیت بیری دایکت بکەیت. ئەحمەد ویسـتی خۆی بێبـاک پیشـان بـدات و گوتی نە خـاڵە گیـان گوێم نەداوەتێ، بەڵام چونکە یەکەم جارە دوور ئەکەومەوە بۆیە تۆزێ بۆ منیش و بۆ دایکم و بۆ ئەوانیش زەحمەتە.

خاڵە ویستی ئەحمەد سەرقاڵ بکات، دەستی کرد بە قسە و پرسیار لە کـابرای تەنیشـتیانی پرسـی کە بـۆ کـوێ ئەچێـت و ئیشـی چییـە و لە کوێوە هاتووە و لەوەی پێشیەوەشی و دیسان چەند قسە و پرسـیاری کرد. دوایی خاڵە مچە دەستی نایە پەناگوێی و دەستی کرد بە هەندێ مـنگە منـگ و گـۆرانی، لەپـڕ کـۆکە پێـی بـڕی و چـاوی پـڕ کـرد لە فرمێسک و هەناسـەی سـوار کـرد، خـاڵە بە دەم کۆکە کۆکەوە گوتی هەی نەعـلەت لە بـاوکی کـۆکی، بـۆچی ئەهێڵێت. دوای ئەوەی هەنـدێ هاتەوە سەرخۆ لە جەماعەتی پرسی کە ئایا کەسیان گۆرانی ئەزانـن؟ هەر ئەوەندەی خاڵە مـچە ئەم قسـەیەی لە دەم هـاتە دەرێ، کابراکەی لە پێشـەوە دانیشـتبوو هەروەک لە خـوای ویسـتبێ وا بـوو. هەر گـورج نەرمە کـۆکەیەکی بـۆ کـرد و قـوڕگی پـاک کـردەوە و دەسـتی نـایە پەناگوێی و دەنگی لـێ هەڵبـڕی و دەسـتی پـێ کـرد. ئەمیـان ئەبڕایەوە بەبێ وچان و هەناسەدان دەستی ئەکرد بەوەی تـر، یەک لەسـەر یەک بەبێ پشوودان. بەینێکی باشـی پـێ چـوو ئەحمەد خەیـاڵی ڕۆییبوو و بیری لەم سەفەرەی ئەکردەوە و دڵی لای دایکـی و مـاڵی خۆیـان بـوو. کابرای تەنیشتیان خەریک بوو خەوی لێ ئەکەوت.

خاڵە مچە تـاقەتی چـوو و جووڵە جووڵی پـێ کەوت و یەک دوو جـار کـۆکە گرتـی، کـابراش وا گەرمـی کردبـوو هەر ئاگاشـی لە کەسـیان

نەمــابوو، خــاڵە دوو ســێ جــار لا الــە الا اللــەی کــرد و یەک دوو استغفراللەی کـرد، بەڵام کـابرای گـۆرانیبێژ هەر گوێشـی لـێ نەبـوو. ئـاخری خـاڵە مـچە چاری نەمـا دەسـتێکی بـرد و خسـتیە سـەر شـانی کابرا و وەک پاڕانەوە گوتی ئەرێ باوکەکەم؟ نـازانم چۆنـت پـێ بڵـێم، خـۆا قەوەتـت بـدات، یـاڕەبی ڕووی دایکوباوکـت سـپی بێـت. دەنگـت ماشاءالله زۆر خۆشە.

ئۆتـومیلچییەکە بە تەواوی بێتـاقەت و بێـزار ببـوو، چـونکە کـابرای گۆرانیبێژ لە تەنیشـتیەوە بـوو، لەبەر ئەوە لە خـوای ویسـت کە خـاڵە مچە کابرای بێدەنگ کرد، بۆیە خاڵە بە پەلە و خێرا قسـەی بەسـەردا هێنا و هەندێ پرسیاری لە کابرای گۆرانیبێژ کرد لە بابەتی گۆرانی و دەنـگ خۆشـییەوە، کە بەشـکم ئەمە خـوایە گـۆرانی لە بیـر بەرنەوە، بەڵام باش بوو ئیتر گەیشتنە چایخانەکەی دەربەندی بازیان.

ئۆتومبیل ڕووی کردە چایخانە و لە بەردەمیدا ڕاوەستا و هەموویـان دابەزیـن. خـاڵە مـچە کەوتە قسـەی خـۆش و پێکەنـین زۆریشـی لەبەر ئەحـمەد بـوو، کە جـار بە جـار بە مـاتی ئەهـاتە بەرچـاوی. جەمـاعەت هەریەکەیـان چـوون بە لایەکـدا، ئەحـمەد و خـاڵەش لە تەنیشـت یەک دانیشتن و داوای چـا و ماسـتاویان کرد. خـاڵە سـەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و ڕووی کردە ئەحمەد و بە چرپە گوتی ئەرێ بـاوکم خـۆ کفرمان نەکرد گوتمان بۆ تۆزێ گـۆرانی نـاڵێن، بە زاتـی خـوا تـۆزێکی مابوو لە دەستم دەرچیت و بڵێم کورە باوکم گێژ بووین بیکە لە ڕێی خوادا بێدەنگ بە.

خاڵە قاقایەکی لێ دا و گوتی خـۆزگە دەنگیشـی خـۆش بـوایە. ئەحـمەد بە زەردەخەنەوە و بە چـرپە گـوتی لەوە ترسـاوم کە سـوار بـووینەوە جارێکی تر دەستی پێ بکاتەوە. خـاڵە دایە پڕمە پێکەنـین و دەسـتی دا لە سنگی خۆی و گوتی مەترسە ئەوە بۆ خاڵتی بەجـێ بهێڵە، عیلاجـی ئەکەم. هەموویان گەڕانەوە لای ئۆتومبیل و سوار بوونەوە، ئۆتومبیـل کەوتە گەڕ و ڕێ. کـابرای گـۆرانیبێژ یەک دوو جـار کـۆکی، هەروەک

قورگی حازر کات بۆ گۆرانیوتن. خاڵە مچە ڕاپەڕی و لە دڵی خۆیدا گوتی ئەرێ بە خوا وا دیسان دەست پێ ئەکاتەوە. لەبەر ئەوە گورج سەری بردە نزیک ئوتومبیلچییەکە و گوتی ئەرێ کاک عومەر ئەوە ئوتومبیلەکەت ڕادیۆی تیا نییە؟ عومەری لێخوڕ گوتی بەڵی خاڵە گیان، بەڵام ئەریەلەکەم شکاوە، قایمکردنی ئەوێت. زۆرم پەلە بوو بۆیە نەمتوانی چاکی کەمەوە. لێخوڕەکە وای گوت و خێرایی ئوتومبیلەکەی کەم کردەوە و گوتی بۆچی خاڵە گیان حەزت لە ڕادیۆیە؟

خاڵە گوتی ئەرێوەڵا حەز ئەکەم تۆزێ گوێ لە قورئان بگرم.

گۆرانیبێژەکە هەڵیدایێ و گوتی قوربان ئینجا ئێستە کوا وەختی قورئانە؟ سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و گوتی هێشتا سێ چارەکی ماوە.

ئوتومبیلەکە ڕاوەستا و ئوتومبیلچییەکە دابەزی و گوتی یائەڵا با بزانین ئەریەلەکە چییەتی. ئەحمەدیش دابەزی لەگەڵی و هەردووکیان چوونە پشت ئوتومبیلەکە. عومەری لێخوڕ سەیرێکی ئەحمەدی کرد و پێکەنی و بە ئەسپایی گوتی ئەگەر ئەم ئەریەلەم بە جامانەکەم بەستووە قەت ناهێڵم جارێکی تر گۆرانی بڵێت. ئەحمەدیش بە دڵ پێکەنی و بە هەردووکیان ئەریەلەکەیان چاک کردەوە. ڕادیۆ کەوتە ئیش و ئوتومبیلەکەش کەوتە ڕێ. کابرا لە دوای یەک دوو دەقیقە گوتی ئینجا چووزانین ئەڵێ چی من عەرەبی نازانم. خاڵە مچە گوتی من وەک بولبول ئەزانم کە شتێکی ئەوتۆی باس کرد پێتان ئەڵێم کە چیی گوت.

لێخوڕەکە گوتی ئەریەلەکەم باش نییە، کوردییەکە زۆر خشە خش ئەکات. هەرچەند ئەحمەد ئەیویست خۆی وەکو پیاوێکی تەواو پیشان بدات، بەڵام لەپڕ خەیاڵی ئەڕۆیشت و هەندێ جار مات ئەبوو، چونکە وەکو شتێک ئەم سەفەر و هاتنەی زۆر کتوپڕ بوو و ماوەی بیرکردنەوەی نەبوو، کە ڕەنگە بە مانگ و دوو مانگیش نەتوانێت

بگەڕێتەوە سلێمانی، ئەی دایک و باوکی و خوشک و براکانی چۆن وا لەپڕ لێیان دوور کەوێتەوە؟ ئەی ڕەفیقەکانی خۆ زۆریان هەر نەیانزانیوە، مەعلوم ئێستە عاجز ئەبن و گلەییشی لێ ئەکەن.
ئەحمەد دڵی گوشرابوو مێشکی ئاڵۆز. لەپڕ گوڕی دایە خۆی و لە دڵی خۆیدا گوتی ئەمەی بۆ چییە؟ با وابزانم دوور کەوتوومەتەوە بۆ خوێندن، یان وابزانم براوم بۆ عەسکەری، هەرچۆنێک بێت ئێستە ڕادێم. نابێ ئەم هەلە چاکەی خوا بۆی ناردووم لە دەست خۆمی بدەم. هیی وا هەیە دوو عومری منی هەیە هەر نیوەی ئەم ئیشەشی دەست نەکەوتووە. چەند ساڵە ڕەنج ئەدەن و تەقەلا ئەدەن و چەند شارەزاییان پەیدا کردووە و چەند هیلاک بوونە، هێشتا هەر ناگەنە ئەم ئیشەی من بە چەند ساڵی تریش. خوا یەکێکی وەک خاڵە مچەی بۆ ناردووم نە کوڕی هەیە نە کچ و نەکەس لەو ژنە فەقیرە نەخۆشە زیاتر. نەء، نابێت گوێ بدەمە بیری منالانە. وا عومرم بۆ بیست ساڵ ئەچێت، ئیتر چی؟ دوای ئەم بیرکردنەوانە ئەحمەد گۆڕا و کرایەوە و تێکەڵی قسە بوو لەم قسەیەک و لەم باس و ڕووداوێک ڕادیۆش هەر ئیشی ئەکرد، بەینێکیش جەماعەت بێدەنگ بوون و گوێیان لە قورئان گرت، ئیتر گەیشتنە گرد و بەرزونزمیی دەوروبەری شارە جوانەکەی کەرکووک.
ئۆتومبیل لە بەردەمی مسافرخانەی مستەفا ڕاوەستا، خاڵە مچە دابەزی پشت و قاچیشی هەندێ کووڕ و ڕەق ببوون لەبەر دانیشتنی ناو ئۆتومبیل، ئەحمەدیش دابەزی و جانتاکەی وەرگرتووە و خواحافیزییەکی گەرمیان لە عومەری لێخوڕ و هەردوو ڕێبوارەکە کرد و چوونە ناو مسافرخانەکەوە.
فەسڵ سەرەتای پایز بوو، خەڵک هەموو چووبوونە ژووری، شەو ساردی کردبوو، بە تایبەتی شەوە خۆشەکانی شاری کەرکووک، کە بە ڕۆژ چەند گەرم ببوایە، شەوی زۆر فێنک و خۆش ئەبوون.

خاڵە مچە دەستی نا بە دەرکی ژوورێکی مسافرخانەکەوە و ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی دەی باوکم، ئەمەش ژووری تۆیە، یاخوا بەخێربێیت و خێرت لەگەڵ خۆت هێنابێ. پێم گوتبوون کە ئەم ژوورە پاک و جوان ڕێک بخەن، چونکە خوشکەزایەکی زۆر خۆشەویستم ئەهێنم لەگەڵ خۆم و ئەم ژوورە ئیتر بۆ ئەو ئەبێت. خاڵە مچە جارێکی تریش بە ئەحمەدی گوت دەی باوکەکەم، تۆزی پشوو بدە و دەموچاوت بشۆ و وەرە بڕۆین شتێکی بخۆین.

ئەحمەد چاوێکی بە ژوورەکەدا خشاند و بە خۆشییەوە گوتی ئینجا خاڵە گیان لەم ژوورە خۆشتر هەیە و دەستێکی دا لە نوێنەکان و گوتی نوێنەکانیش چەند پاکوتەمیزن.

خاڵە مچە چووە نزیک پەنجەرەکە کە ئەیڕوانییە سەرجادەی بەردەمی مسافرخانەکە و گوتی ئەوەی هەیە گرم و هوڕی ئوتومبیل ناهێڵێت کەس بنوێت. بەڵام چەند شەوێکی تر لەگەڵ ئەویش ڕادێیت، ئیتر وائەزانی لایلایەت بۆ ئەکەن. خاڵە پێکەنی و گوتی من ئێستە وام و پێی نازانم کەچی زۆری مسافرەکان بۆڵەبۆڵ ئەکەن و ژوورمان پێ ئەگۆڕن. ژووری تر هەیە دەنگەدەنگی کەمە، بەڵام ئەم ژوورەیان زۆر دڵگیرە، حەز ئەکەم لەگەڵ ڕابێیت ئەحمەد بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە گوتی خەمت نەبێت خاڵە گیان، بە خوا کە نوستم تەپڵیشم بۆ لێدەن بە خەیاڵمدا نایەت، خەوم هەنێ قورسە. ئەحمەد چوو بۆ حەمام و دەموچاو شتن خاڵەش چووە دەرێ، لە ژوورەوە شاگردی و کوڕە ئیشکەرەکانی مسافرخانەکەی کۆمەڵ بوون و بەخێرهاتنیان کرد و کردیان بە غەڵبە غەڵب و قسە و باس ئەحمەدیش هاتە لایان و پێکەوە چوون بۆ ژووری نانخواردنەکە، کە وەک چایخانەیەکی بچووک وا بوو، چەند مێز و کورسی بە جیا جیا تیا دانرابوون و لەسەری ژوورەکە سەکۆ و کوورەیەکی ئاگرکردنەوەی تیا بوو لەسەر سەکۆکە، سەماوەرێکی گەورەی زەرد گیزە گیزی ئەهات، لەملاوئەولای پیاڵە و قۆری و سینی و شەکر و قوتووەچای لەسەر

ڕیز کرابوو، لە تەنیشتی ئەو چایخانەیە ژووریکی تر بوو، لە ژووری چێشتخانە ئەچوو، دوو سێ کوڕ و پیاوی لێ هاتە دەرێ، یەکی بەروانکەیەکی سپییان گرتبوو بە بەر خۆیانەوە، دیسانەوە هەموو شاگرد و ئیشکەرەکان لە خاڵە ئالان و بە ڕوویەکی خۆشەوە بەخێرهاتنی ئەحمەدیان کرد. یەکێک لەو شاگردانە لە خاڵە هاتە پێشەوە و دەفتەریکی بچکۆلەی لە گیرفانی بەرباخەڵی دەرهێنا و گوتی خاڵە گیان لە دوێنێوە ئەوەندە مشتەریمان هەبوو ژوورەکان هەموویان گیرابوون. پێش پێی ئێوە دوانیان ڕۆیشتن، کەچی هێشتا ژوورەکەمان پاک نەکردبووەوە، دوانی تر هاتن ژن و مناڵیشیان لەگەڵە. خاڵە مچە بە بێزارییەکەوە گوتی جارێ سەرمان گێژ مەکەن و وازمان لێ بێنن، چیتان هەیە برسیمانە، سەرمان ئێشێت، چایەکی جوانیشمان بدەنێ خێری ئیمانتان.

کوڕە دەفتەر بە دەستەکە پێکەنیی و گوتی ئەمر ئەکەیت، هەر ئێستە خواردنتان بۆ ئەهێنین، تۆ هەر سەبرکە و شەڕمان پێ مەفرۆشە.

خاڵە بە گاڵتەوە وەکو بیەوێ بۆی بچێت و لەسەر جێگاکەی ڕاپەڕی و بەرز بووەوە و گوتی ئەڵێم زۆر چەنە مەدە، هیلاکین.

ئەحمەد و خاڵە لە نانخواردن بوونەوە و یەک دوو چاشیان خواردەوە، ئینجا هەستان و چوونە دەرێ لە ژوورەکە. خاڵە ژووریکی سەرپەڕیشی پیشانی ئەحمەد دا و گوتی ئەمەش ژووری منە و لێرە ئەنوم ئەگەر ماڵەکەمان هەندێ چۆڵ بێت، ئەچمەوە ماڵێ، چونکە خاڵۆژنیشت بەسەزمانە، هەر لە ماڵەوەیە و دەرەوەی نییە، منیش حەز ئەکەم هەمیشە دەوری قەڵەباڵغ بێت. خاڵە پێکەنیی و کۆکە ورووژمی بۆ هێنا و بەدەم هەناسە بڕکێوە گوتی هەندێ جار ماڵەکەمان وای لێ دێت، بڕا هەر ڕائەکەم و خواخوامە کە ئیتر نەچمەوە، بە تایبەتی خاڵۆژنت دوو خوشکەزای هەن، یەکی دوو سێ مناڵی هاریان هەیە داروبەردی ئەو ماڵە دێننە خوارەوە، بێجگە لە شاتە و قیڕە قیڕ، ئیتر کە ئەوان دێن شەو هەر ناچمەوە. خاڵە بە

زەردەخەنەیێکی خۆشـەوە گوتی بەڵام لەمەودوا ناچـار ئەبـم گـوێم لەو قڕە قڕ و دەنگە دەنگە بێت. ڕاسـتییەکەی حەز ئەکەم لە مـاڵەوە بنـوم، زیـاتر ئیسـراحەت ئەکەم. لێرە هەراسـانم ئەکەن و جـاری وا هەیە دە جـار دێـنە سـەرم و خەبەرم ئەکەنەوە، هەنـدێ جـار ئەوەنـدە تـووڕە ئەبم، ئیتر مەپرسە وەکو یەکێک لەم کوڕانەی دیتن، دێنە سـەرم و لە خەوەکە هەڵمەستێنێت و ئەڵێت خاڵە چەند دەسک کەرەوز بکڕین؟ دە ئینجـا وەرە شـێت مەبە. ئەڵـێم کـوڕی بـاوکم ئەوە مـن ئەیـزانم یـان چێشـتکەرەکە. خـاڵە سـەری بـا دا و گـوتی نەنەنە تـاقەتم نەمـاوە پیـر بووم، زوو زوو هەڵدەچم، بەڵام ئەوەی باشە کەسیان لێم عـاجز نـابن و هەرچییەک بڵێم نـایگرنە دڵ هەموویـان زۆر کوڕی چاکن، زۆریـان دەمـێ سـاڵە هەر لێـرەن. ئەو کـوڕەی دەفـتەری پـێ بـوو و باسـی مشـــتەریی بــۆ کــردم، ئەوەیــان زۆر ئــازایە، پەنجــا مشـــتەری بە چاوترەوکانێـک ڕایـی ئەکـات، بەڵام خـوا نەکـا کەس تـووڕەی بکـات، ئەوسـا هەر ئەبێت بە شـێتێکی تەواو و هەرچێکی بە دەسـتەوە بێـت، هەڵـــی ئەدات، وەکـــو لەم ڕۆژانەدا بەیـــانییەک تـــاوەیەکی گەورە هێلکەوڕۆنـی بـۆ مشـتەری چـاک کردبـوو، ئەبێـتە مشـتومڕێ لەگەڵ چێشـــتکەرەکە، ئیتــر پەلامــاری تــاوەکە ئەدا و قلْپــی ئەکــاتە نــاو ئاگردانەکەوە و هەڵی ئەداتە لایەکی ژوورەکە. بەڵام چارم نییە کە لێی قبەوڵ ئەکەم و ئەوەی باشـە شـکور کەم کەم وای لـێ دێـت، چـاکەی زۆر زۆرتـرە لە خـراپەی، کوڕەکـانیش هەموویـان ئەیناسـن، ئەوەنـدە لەگەڵی ناڵێن.

ئەحمەد گوتی فایدەی چی، خۆزگە وا نەبوایە.

خـاڵە مـچە گـوتی زۆرم تـاقی کـردووەتەوە، بە دەسـت خـۆی نیـیە کە تـووڕە ئەبێت، ئیتـر دەسـەڵاتی بەسـەر خۆیـدا نـامێنێ و دۆ و دۆشـاو تێکەڵ ئەکات، بەڵام وەکو تر زۆر کوڕی چاک و پیاو و دڵپاکە.

خـاڵە مـچە دەسـتی دا بە پشـتی ئەحـمەددا و گـوتی یـاخوا ڕۆڵە زۆر بەخێر بێیت، بە ڕاستی تـاقەتم نەمـاوە و زۆر پێویسـتم بە دڵسۆزێکی

وەکـــو تـــۆ هەیە. ئەمـــانەش هەمـــوو کـــوڕی باشـــن، بەڵام هەنـــدێ حەســـوودن و بەغیلییـــان بە یەکتـــر دێـــت و زۆر جـــار بەرئەبـــنە سەروپوتەڵاکی یەکتر و من ناڕەحەت ئەکەن.

ئەحمەد بە تەریقییەوە گوتی پشت بە خوا ئیتر ناهێڵم هەر کەس بێت بە لاتەوە و ناڕەحەتت بکـات و بـۆ خـۆت هەر پشـوو بـدە و بنـو و خەیاڵت لای کەس نەبێت و انشاءالله هەر خۆش ئەبیت بۆمان.

خاڵە مچە بەینێکی تریش لەگەڵ ئەحمەد مایەوە و هەموو ژوورەکانی پیشـان دا و سـەرەوخواری مسـافرخانەکەی لەگەڵ کـرد و هەنـدێ ئامۆژگـاریی بە کوڕەکـان ڕاسـپارد و خواحـافیزیی لـێ کـردن و بە ئەحمەدی گوت کەوا ئیتر خۆی ئەڕواتەوە مـاڵێ و ماڵەکەیان ئەوەتـا زۆر نـــزیکە و بەیـــانی دەوری ســـەعات نـــۆ دێـــمەوە بـــۆ لات و خواحـافیزیی لـێ کـردن و ئەویـش تـاکو بەردەرگـاکە لەگەڵـی چـوو و بەڕێی کرد و خۆی گەڕایەوە و چووە ژوورەکەی خۆی.

ئەحـــمەد چـــاوێکی تـــری بە ژوورەکەیـــدا خشـــاند و چـــووە نزیـــک پەنجەرەکە کە ئەیڕوانییە سەر جادە قەڵەباڵغەکەی کە خاڵە مچە گوتی هەمیشە فرک و هوڕی ئوتومبیل پیادا دێن و ئەڕوات و پەردەکەی لا دا و لەوێوە سەیری دەرەوەی کرد و ڕیزە دوکانەکان دی کە وەختـی خۆی بە منـاڵی چەند لەگەڵ بـاوکی ئەهـات کە ئەچوونە ئەو دوکانـانە دەلـوبیبەر و سـڵق و سـەوزە جـوانەکەی کەرکووکیـان ئەکـڕی و بـۆ دایکیـان ئەبرد بە دیـاری. ئەحمەد لە دڵـی خۆیـدا گـوتی چەند دەمـیکە نەهاتووم بۆ ئەم ناوە.

ئیتـــر پەردەکەی داخســـتەوە و چـــوو لەســـەر جێگـــاکەی دانیشـــت و جانتـــاکەی کـــردەوە و یەک دوو کتێـــب و ڕۆژنـــامەی هێنـــایە دەرێ و خستیە سەر مێزەکەی بەردەمی. خاولی و سۆڵ و وردە کەلوپەلەکانی تـــری دەرهێنـــا جلـــی شـــەو و خـــاولییەکەی بە ســـنگەوە هەڵواســـی، هەروەک ئەیویسـت شـتەکانی دامەزرێنێت و کە ئەم ژووررە ئیتـر هیـی ئەوە. سـەیرێکی سـەعاتەکەی دەسـتی کـرد و لە بەر خـۆیەوە گـوتی

سەعات هێشتا نەبووە بە هەشت، ئێستە چی بکەم؟ ئەحمەد خۆی دایە سەر جێگاکەیدا و گوتی با تۆزێ پاڵ بکەوم باشترە. پاڵ کەوت و چاوی بڕییە سەقفی ژوورەکە و هەردوو دەستی لە یەک ئاڵاند و خستیە سەر سەری، بە خەیاڵ چووەوە سلێمانی. هاتە بەرچاوی کە چۆن ئێستە ماڵەکەیان بەو هەموو قەڵەباڵغییەشەوە کە هەیە چەند کشوماتە، چۆن ئێستە هەموو دڵگیر دانیشتوون و کەس ناوێرێت لەبەر دایکی ورتەی لە دەم بێتە دەرێ، چونکە بە جارێک هەموو داخی دڵی خۆی پێیان ئەڕێژێت. لە سبەینێوە ئیتر ئەشیانکوژێت لە برساندا و ئەو شتەی من حەزی لێ ئەکەم قوڕ بەسەر ئەو کەسەی ئەیخوات، بە خوا لە کونە لووتییەوە دەری ئەهێنێت و لە قوڕگی گیر ئەکات، ئەوەندە ئەڵێت وای دایکی بمرێ ئەحە گیان حەزی لەم خواردنە بوو. ئەحمەد بە زەردەخەنەیەکەوە لەبەر خۆیەوە گوتی وەکو ئەحە گیانی لە چۆڵ و بیاباندا پەکی کەوتبێ و ڕێی لێ ون بووبێ و ئاو و نانی لێ بڕابێ. ئێستا هەر شتێکمی بەرچاو کەوتبێ و ڕێی لێ ون بووبێ و ئاو و نانی لێ بڕابێ، ئێستا هەر شتێکمی بەرچاو بکەوێت چینێک ئەگری. ژوورەکەم، کێ ئەتوانێ بچێتە ناوی ئەو هەموو مناڵە بەسەر سکی یەکتردا کەوتوون، کێ ئەوێرێت بڵێت ئەرێ ئەو ژوورە خۆ چۆڵە، دە با دوانی گەورە و ئاقڵ بچن لەوێ بنوون، کێ حەدی هەیە وا بڵێت، بە خوا زمانیان ئەبڕێت. وا لەبەرچاومە ڕەسمەکەمی بە دەستەوەیە بە لکی سەرپۆشەکەی ئەیسرێتەوە و ماچی ئەکات، من خۆم لەوێ بووم وای ئەکرد چی جای ئێستە و بە چاوی فرمێسکاوییەوە ئەیخاتەوە جێی خۆی لە تاقەکە. ئەحمەد هەڵگەڕایەوە سەر ئەولای و لە دڵی خۆیدا گوتی ئیتر دایکم وایە، نازانم باسی چێ بکەم و چی نەکەم، تۆبڵێی هەموو دایکەکان وا بن؟ بە ڕاستی ئەمەی دایکم ئەیکات وابزانم لە حەد چووەتە دەرێ، ماڵ کاول نەبووە هەر خۆی ئەکوژێت ئەوەندە بە

تەنگ مناڵەکانیەوەیەتی. ئەحمەد هەندێ دڵی گوشرا و لە دڵی خۆیدا گوتی بە تایبەتی بەرامبەر بە من.
ئەحمەد هەر لەسەر خەیاڵی خۆی ڕۆیشت و ئەتگوت لەسەر پەردەی سینەما ماڵی خۆیان ئەبینێت، بۆیە ئەم جارە بیری لە باوکی کردەوە، ئێستە باوکم هاتووەتەوە ماڵێ مات و مەلوول، بەڵام نایباتە سەر خۆی و نایەوێت خۆی زەعیف و بێورە پیشان بدات. ئێستە دڵخۆشیی دایکم ئەداتەوە و ئەڵێت کوڕ شکور گەورە بووە و وازی لێ بێنە بڕوات بەپێی کاری خۆیەوە، خۆ ئیتر مناڵ نییە لێ بترسین. کاک مستەفا کوڕی تاقانەی بوایە ئەوەندەی ئەوی خۆش نەئەویست، دەمێک بوو پێی گوتبوم هەر ئیمڕۆ و سبەینێم پێ ئەکرد. لە دڵیشیدا تۆزێ لە دایکم کەمتر هەراسان بووە، ئەحمەد گورج بووەوە و دانیشت و زەردەخەنەکەی گرت و لەژێر لێوەوە گوتی جەژنی کەس نییە نەریمان نەبێت، ئێستە خۆی گیڤ کردووە بەسەر مناڵەکاندا و خۆی کردووە بە کوێخا بەسەریانەوە، ئەم دەمکوت ئەکات و ئەو هەڵەسێنێ ئیشی بۆ بکات. ئێستە بیانوو بە دایکم ئەگرێت و پارە لە باوکم ئەکێشێتەوە و دیسان شەو درەنگ دێتەوە ماڵێ و دەرسەکانیشێ گوێی ناداتێ. ئەحمەد پاڵ کەوتەوە و بەدەم خەیاڵەوە مستەکۆڵەیەکی بە ئەسپایی لە جێگاکەی دا و گوتی خۆ بە خوا ئیمساڵ دەرنەچێت هەر ئەیکوژم. بەڵام قەیناکا، ئەمانەم هەمووی بە شەو بۆ گوتووە کە هەرچییەک روو بدات لەو ماڵە بۆم بنووسێت تاکو ئاگام لێیان بێت.
ئەحمەد بە تەوسەوە سەری با دا و لە دڵی خۆیدا گوتی باوکیش بێقەزا بێت زۆر بۆی شل کردووە، بەو بێت کاڵەک و ترۆزیی پێ ئەفرۆشێت لەجیاتیی مەکتەب، هەموو جارێکیش کە شەڕ ئەکەم لەسەر ئەوەی گوێ ناداتە دەرسەکانی، ئەڵێت کوڕم خوا ڕزق ئەنێرێت، بۆچی هەر ئەبێت مەکتەب و عیلم بێت. ئەویش لە خوای ئەوێت گوێی لە قسەی وا بێت، ئەحمەد جارێکی تر هەستا و

دانیشتەوە و لەبەر خۆیەوە گوتی هەر ئەبێ بخوێنێت، بە خوا چاوی دەرئەهێنم و دەستێکی برد کتێبێکی گرت بە دەستەوە و لاپەڕەکانی هەڵدایەوە و سەیرێکی کرد، بەڵام گورج کتێبەکەی داخستەوە و دای نایەوە شوێنی خۆی.
لەپڕ ئەحمەد وەک شتێکی بیر کەوتبێتەوە، لە ژێر لێوەوە گوتی ئای ئای، بیرم نییە ئێستە دایکە ڕەعنام بێتەوە لە هەڵەبجە و نەمبینێت ئاخۆ چییان بەسەر دێنێت؟ ئەحمەد زەردەخەنەیەک گرتی و لە دڵی خۆیدا گوتی حەی حەی ئەوم لە بیر نەبوو، بە خوا هەمویان مەگەر خۆیان بشارنەوە لە دەستی، هەر لە باوکمەوە تاکو مامە حاجی عەلیم. مامە عەلیم گوتی بە خوا ڕەعنای خوشکم بێتەوە و ئەحە نەبینێ، حەیامان ئەبات و ئەیکا بە هەرا. ئەحمەد سەری بادا و لەبەر خۆیەوە گوتی یاخوا خاڵە مچە گیان خوا عەمرت درێژ کات هەروەک ڕەشەبا هاتی لوولت دام و هێناتم بێ ئەوەی کەس بزانێت نزیکترین هاوڕێم نەیزانیوە کە هاتووم، یاخوا هەر خۆش بێ، چەند پیاوێکی ڕۆح سووک و بەکارە و بەغیرەتییشە، بەو قەڵافەت و قەڵەوییەشیەوە چەند لەشسووکە و چەند ئەچێتە ژێر باری تەگەرە و موشکیلەی هەموو کەسێکەوە، هەر لە خزمەوە تاکو بێگانە هەر کەسێک ڕێی تێبکەوێت و داوای یارمەتیی لێ بکات.
دوو سێ جار خونچەش هاتە خەیاڵی ئەحمەد و دیمەنە جوانەکەی و قەدوباڵا و ڕۆیشتنەکەی و زەردەخەنە شیرینەکەی. بەڵام ئەحمەد گورج هەستایە سەرپێ و ڕاپەڕی هەروەکو کفرێکی زۆر گەورەی کردبێ و بە پەلە دەرگاکەی کردەوە و چووە دەرێ. یەکێ لە کوڕەکانی پێ گەیشت ئەو کوڕەی خاڵە مچە باسی تووڕەیی و ئازایی کردبوو. ئەحمەد سەلامی لێ کرد و گوتی کاک ڕۆستەم خەریکی چیت؟ ڕۆستەم بە ڕوویەکی خۆشەوە هاتە پێشەوە لێی و گوتی کاکە ئەحمەد ئەوە نەنوستووی؟ خۆ ئەوە من چەند جارێک بە بەردەمی ژوورەکەتدا هاتم و چووم، دڵم نەهات دەرگاکەت بکەمەوە، جارێک

ئەمگوت ئەترسم نوستبێ و جارێکیش ئەمگوت نەوەکا بە تەنیایی تاقەتت چووبێ.
ئەحمەد جوابی دایەوە و گوتی ئەرێوەڵا کاکە هەندێ پاڵ کەوتبووم، بەڵام نوستنی چی، هێشتا ئیوارەیە و هەردووکیان پێکەوە چوون بەرەو چایخانەی مسافرخانەکە و شوێنی کوڕەکانی تر.
هەفتەیەک بەسەر هاتنی ئەحمەد تێپەڕیی، ئەویش بە دڵ و بە گیان چووە ناو ئیشەکەیەوە. بەو چەند ڕۆژە زۆر خۆی خۆشەویست کرد لای شاگرد و کوڕەکانی تر. قسەخۆش، نەرم و لەسەرخۆ، دڵپاک و بەحورمەت، لە کن خۆی جێگیری خاڵە مچە بوو و ئەوانەی کەوتنە ژێر دەستی هیی وایان هەبوو بەقەد باوکی بوو، بێجگە لەوانەی دەمێ ساڵ بوو لەو مسافرخانەیە ئیشیان ئەکرد و لەجیاتیی تووڕە بن و بڵێن ئەمە کێ بوو لەسەر حازر هات و بوو بە گەورەمان، کەچی بە پێچەوانە، ئەوەندەیان پێ خۆش بوو نەبێتەوە، چونکە ئەحمەد نەک خۆی لەوان بە عومر بە بچووکتر دائەنا، بگرە بە پلەی ئیشیش خۆی لەوان بچووکتر و هەروەکو ئەوان دائەنا. لەو ماوە کەمەدا ئەحمەد وای لە خۆی کردبوو لە لای هەموویان زۆریان لە بەینی خۆیاندا و هەندێک لە دڵی خۆیاندا بڵێ یاخوا کاکە بەخێر بێیت، وەکو لە بۆڵە و خوتەی خاڵە مچە ڕزگارت کردین، باوکم ئەمە گوێ ئەداتە قسەی خەڵک و تێئەگات کە چیی پێ ئەڵێت. بەڵام خاڵە بێقەزابێ، جاری وا هەبوو خۆمان هەڵواسیایە ئەو هەر ئەیگوت وانییە و ئێوە درۆ ئەکەن.
خاڵە مچەش بە جارێک کەوتە خۆشی و ئیسراحەتەوە، بە دڵنیایی و بە خەیاڵی ئاسوودە بە ئارەزووی خۆی ئەنوست بە ئارەزووی خۆی هەڵەستا و کە ئەشهاتە مسافرخانەکە، لەگەڵ ڕەفیقەکانی خەریکی تاوڵە و دۆمینە و قسەی خۆش ئەبوو. ئەحمەد بە جارێک ژیانی خاڵە مچەی گۆڕی و ئەوەندەی تر قاقای پێکەنینەکانی دەنگی دایەوە.
خاڵە مچە چەند جارێکیش ئەحمەدی لەگەڵ خۆی بردە ماڵەوە و فاتمەخانی ژنی زۆری پێ خۆش بوو و دوعای بۆ ئەکرد و

ماشاءاللەی لێ ئەکرد وا بووە بە پیاو، چونکە دەمێک بوو ئەحمەدی نەدیبوو. جارێکیش لەو سەردانانە خاڵۆژن ڕووی کردە مێردەکەی و گوتی انشاءالله ژنێکی جوان و ڕەزاسووکیشی بۆ ئەهێنین. ئەحمەد سوور هەڵگەڕا و تەریق بووەوە و سەری داخست.
خاڵە مچەش بە پێکەنینێکی خۆشەوە دەستی دا بە پشتی ئەحمەددا و گوتی ئەی چۆن، انشاءالله ژنێکی وا جوانی بۆ ئەهێنم نەبێتەوە، هەزار کچی جوان هەیە منەتیش ئەبەن کە شوو بەم کوڕە قۆزە بکەن، ها ئەحە گیان تۆ ئەڵیی چی؟ ئەحمەد دیسان سوور هەڵگەڕا و بە زەردەخەنەیەکی شەرماوییەوە گوتی ژنی چی؟ تاقەتی ژن و منم نییە.
خاڵە دایە قاقای پێکەنین و گوتی ئێ باشە کە نەسیب هات و گوتی دەی وا ئەیهێنی ڕەنگە پرسیش بە کەسمان نەکەیت.
ئەحمەد پێکەنیی و گوتی قەت شتی وا ناکەم، ئەگەر ڕۆژێک هەر هێناشم پێش هەموو کەس و پێش باوکیشم ئەبێ بە جەنابت بڵێم.
لەگەڵ ئەم هەموو گۆڕین و خۆشییەی کە ئەحمەدی تێکەوت و گیرفانی بەتاڵی پڕ بوو لە پارە و بە شەو و ڕۆژێک بوو بە ساحێب مسافرخانە و شاگرد و خەڵکی بەردەست و ئەم بێنە و ئەم بەرە و بە جارێک لە دوو سێ لاوە کاک ئەحمەد بانگ ئەکرا و پرس و ڕای پێ ئەکرا و چەندەها جۆرە خەڵکیش خەریک بوون ئەیانناسی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەحمەد هەستی بە ناڕەحەتییەکی نادیار ئەکرد، هەستی ئەکرد کە شتێکی کەمە. بەڵام هەر هەوڵی ئەدا لە بیر خۆی بەرێتەوە و نەیزانی کە بۆ ئەوەندە بێئارامە. زۆر جار کە بە تەنیا ئەبوو دیسان خەیاڵی ئەڕۆیشت بۆ لای دایکی و ئەوان و لە دڵی خۆیدا ئەیگوت بە ڕاستی زۆریان بیر ئەکەم خۆزگە سەرێکم ئەدان. بەڵام گورج پەشیمان ئەبووەوە و ئەیگوت ئێستە ناڵێن کوێرا خۆ هێشتا نەبووە بە مانگێکی تەواو.
بەیانییەکیان خاڵە مچە هاتە مسافرخانەکە و بە پەلە هەواڵی ئەحمەدی پرسی و خێرا شاگردێکی نارد کە بزانێت لە کوێیە و بانگی بکات.

ئەحمەد لە ژوورەکانی سەرەوە بوو لەگەڵ دوو سێ شاگرد خەریکی گۆڕین و ئاڵوگۆڕی ژوور و پێخەفەکان بوو و بە گەرمی خەریکی ڕێکخستن و خۆشکردنی مسافرخانەکە بوو، سەری زۆر قاڵ بوو. کاتێ بانگیان کرد ئەویش بە پەلە چووە خوارێ و لە دوورەوە خاڵە مچەی بینی و بە هەڵەداوان چووە لای، بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە ڕووی کردە خاڵە مچە و گوتی خاڵە گیان، ئەوە خێرە وا بەم بەیانییە خۆت قۆز کردووە، ماشاءالله ئەوە نیازی کوێت هەیە؟
خاڵە مچە پێکەنیی و گوتی کوڕم سەفەرێکی پەلەم کەوتووەتە بەر ئەبێ بڕۆم بۆ سلێمانی، مەلا کەریمی ئامۆزام کەوتووەتە بەر ئوتومبیل، بەڵام شوکور هیچی لێ نەهاتووە، تەنها هەندێ ئەژنۆی ڕووشاوە و دەستی لە جێ چووە و حاڵیشی باشە و مەترسیی لەسەر نییە، بەڵام ئەوەندە دەم بە هاوار و بۆڵەبۆڵکەرە و بەگلەییە ئەگەر نەچم، تازە ئیتر قەت نەجاتم نابێت لە دەمی، لەبەر ئەوە هەر ئەبێ بڕۆم، دوو شەوی لێ ئەبم و ئەگەڕێمەوە.
بە هاتنی ناوی سلێمانی، ئەحمەد شڵەژا و شپرزە بوو، تۆزێکی ما کە بڵێ دەی دەی توخوا خاڵە گیان منیش بەرە لەگەڵ خۆت و بەبێ من نەچیت، بەڵام خۆی گرت و ڕووی نەهات قسە بکات.
خاڵە مچە گوتی دیارە سەری ماڵی ئێوەش ئەدەم، بەڵام لە سەرێکەوە ئەڵێم خۆمیان پیشان نەدەم نەوەکو حەبەخان یەخەم بگرێت و بڵێت ئەی کوا کوڕەکەم، خاڵە پێکەنیی و کۆکەش تاوی بۆ هێنا و بەدەم هەناسەبرکێ و کۆکەوە گوتی ئینجا ئەوسا کێ ڕزگارم ئەکات لە دەستی.
ئەحمەد گورج هەڵی دایێ و گوتی وەڵا خاڵە گیان وابزانم خۆت پیشان نەدەیت باشترە، چونکە دایکم دیسان دەست ئەکات بە گریان و هەنسکە هەنسک و نارەحەتت ئەکات. وەڵا ڕاست ئەکەیت، بەڵام هەر ئەزانن کە هاتووم چۆن نازانن، ڕەنگە باوکت لە دوێنێوە مەلا کەریمی بەرنەدابێت و هەر بە دیاریەوە بێت. ئەحمەد گوتی ڕاست

ئەفەرمووی، ئەوە خراپترە، دوایی دایکم ئەوەندەی تر ئەشڵەژێت و ئەڵێت ئاخۆ ئەحمەد چیی لێ هاتووە، بۆیە خاڵە بە دزیمانەوە هاتووە و خوا ئەزانێت دوایی ئەیکات بە چ هەرایەک، ئیتر دایکم ئەناسی چۆنە. خاڵە گوتی ئیتر بزانم چارێکی هەر ئەکەم و دوو سێ هەنگاو ڕۆیشت و دوای ئەوە خواحافیزیی کرد، بەڵام لەپڕ وەرگەڕا و ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی وەڵا ئەڵێم تۆش بێیت باشترە. دەی بەم دوو ڕۆژە دونیا کاول نابێت، با دڵی حەباوەخان خۆش بکەین. تاقەتی فرمێسکەکانیمان نییە، دەی باوکم بڕۆ خۆت حازر بکە با بڕۆین، لەگەڵ قەمەرەی ئاشنایەکم ئەڕۆین، بە بەتاڵی ئەڕوات بۆ سلێمانی.

ئەحمەد لە خۆشییاندا حەپەسا و هەر ئەوەندەی پێ کرا کە پەلاماری خاڵە مچە بدات و دەست و سەرشان و هەمووی ماچ بکات و بڵێ کوڕە من ئەڵێم هەر بژی، خاڵە خۆ بە خۆڕایی ناڵێم. بە پەلە چوو هەندێ ئامۆژگاریی کوڕەکانی کرد و سەرێکی ژوورەکەی خۆی دا و هاتەوە لای خاڵە مچە و پێکەوە چوون سواری ئۆتومبیلەکە بوون.

لە ڕێگا ئەحمەد هەژدە هەژدە کەوتە قسەکردن هەموو لەشی پێئەکەنی ئەوەندە دڵی خۆش بوو، ئەگەر خاڵە مچە و لێخوڕەکە باسی شتیکیان بکردایە، لەپڕ ئەمیش تێکەڵی قسەیان ئەبوو و یام ئەیویست ئەویش شتێک بڵێت. جاری وا هەبوو خاڵە ئەیکرد بە شاهید و زوو زوو پێی ئەگوت توخوا ڕۆڵە ئەحمەد وا نەبوو؟ ئەحمەدیش بە گەرمی و بە شەوقەوە جوابی ئەدایەوە و هێشتا خۆیشی شتێکی بۆ ئەخستە سەر.

ئەحمەد خەیاڵی پێش خۆی ئەگەیشتە سلێمانی و ئەهاتە بەرچاوی کە ئاخۆ ئێستە دایکی چی بکات و کە دەرگایان کردەوە و ئەم بوو ئاخۆ چی بڵێن و چەند دڵیان خۆش بێت و ئەم ڕۆیشتنەوە لەپڕە، چەند خۆشە بۆ خۆیشی و بۆ ئەوانیش، بۆ هاوڕێکانی، بۆ ماڵی مامە عەلی. ئاخۆ دایە ڕەعنا ئێستە چی ئەکات، تۆبڵێی لە شار بێت. ئەحمەد سەیرێکی سەعاتەکەی کرد دەستی کرد و لە پەنجەرەکەی

ئوتـــومبیلەکەوە ســـەیریکی ئەو دەرودەشـــتەی کـــرد و هەســـتی بە خۆشییەکی زۆر کرد، حەزی ئەکرد ئەگەر ڕووی بێت نەختێ گۆرانی بڵێت، یان چەپڵە لێ بدات. لەپڕ خاڵە مچە کە شتێکی لێ ئەپرسی و شەوق و خۆشیی لە دەموچاوی ئەحمەددا ئەبینی، پێی ئەگوت هەی کافر، لەوە ئەچێ کە زۆر حەزت ئەکرد بێیت، بەڵام قست نەئەکرد. ئەحمەد بە خۆشییەوە ئەیگوت ئەرێوەڵا خاڵە گیان لەبەر دایکم زۆرم حەز ئەکرد. ئەوەندەی پێ نەئەچوو دیسان ئەحمەد لە کۆڵانەکەی خۆیان ئەبوو. ئەرێ بە ڕاست ئەی ماڵی مامە عەلی چۆن هەر کە دابەزی و ماچومووچی لەگەڵ دایکی و ماڵی خۆیان کرد، بچێت بۆ ئەوێ یان تۆزێ دانیشێت و ئینجا؟ وەڵا هەقە جارێ لە ڕێگاوە پێش ئەوەی بچیتە ماڵی خۆیان، سەری ئەوان بدات ڕەنگە ئێستە زۆری بیر بکەن. ئیتر ئەحمەد ئەم بیر و خایاڵانە ئەیانهێنا و ئەیانبرد و هەست و مێشکیان بە جارێ ورووژاندابوو. زۆری نەمابوو ئیتر گەیشـــتنە یەکێ لە چایخانەکانی ســـەر ڕێگـــا و کـــابرای لێخـــوڕ ئوتومبیلەکەی ڕاگرت و هەرسێکیان دابەزین ئەحمەد لە دڵی خۆیدا گوتی خۆ ئەوەندەمان نەماوە، وەڵا هەق نەبوو دابەزین. بەڵام لەبەر ئەوان ڕووی نەهات هیچ بڵێت و بە شەوق و خۆشییەوە گوتی ئێوە فەرموون دانیشن چیتان حەز لێیە من ئەچم بۆتان ئەهێنم. پاش سواربوونەوە بە نەختێ گەیشتنە سلێمانی. خاڵە مچەیان دابەزاند لە ماڵێ خزمەکەی، ئەحمەدیش لەبەر دەرکی ماڵی خۆیان دابەزیی. کات نیوەڕۆ بوو، کۆلانەکە هەندێ چۆڵ بوو. لە دەرگای دا، وەرگەڕا ڕووی کردە ئەوبەری ماڵەکەیان، کە خانووەکەی حاجی عەلی و خونچە خان بوو، ئەحمەد چاوی بڕییە پەنجەرەکانیان و لە دڵی خۆیدا گوتی ئێستە ئەگەر بە ڕێکەوت بمبینن، ڕەنگە چی بڵێن کەوا لێرە ڕاوەستاون و ناچمە لای ئەوان.

تەپەی پێی خوشکی کە بە ڕاکردن هات دەرگا بکاتەوە ئەحمەدی لە خەیاڵ دا. دەرگا کرایەوە و خوشکە ناوەنجییەکەی باوەشی پیا کرد و

قیڕاندی، دایکی هات. مناڵە وردکە هەندێکیان هاتبوونەوە لە مەکتەب و هەندێک تازە خەریک بوون بڕۆن، هەموو لە ئەحمەد ئالآن و باوەشیان پیا کرد تا ژوورەوە لەگەڵ بەساقە و بەقوربانی دایکی و ئۆخەی ئەوە چۆن بوو هاتی. لە دوێنێوە چاوم ئەفڕی بە شەوبۆشم گوت کەوا شتێک ڕوو ئەدات دڵم خۆش ئەبێت و ئیتر لەم جۆرە قسانە، حەباوەخان دەستی پێ کرد و هەر ئەیگوت و ئەیگوتەوە. ئەحمەد چاوی گێڕا بە ماڵەکەدا و گوتی ئەوە کوا باوکم؟ بە ڕاستی زۆری بیر ئەکەم، خۆ نەخۆش نییە؟ دایکی هەڵی دایە و گوتی نەوەڵا لە دەورت گەڕێم، شکور باشە، بەڵام مامە عەلیت دوور لە گیانی زۆر ناساغ بوو. ئەحمەد بە پەرۆشییەکی زۆرەوە گوتی بۆ؟ خوانەکات چیەتی؟ دایکی گوتی هەفتەیەک بوو زۆر نەخۆش بوو، بەڵام شکور ئێستە چاک چاک بووەتەوە.
دایکی پێکەنیی و جارێکی تر پەلاماری سەروگوێلاکی کوڕەکەی دا و تێر ماچی کردەوە و گوتی ئەی بۆ ناپرسیت دایە ڕەعنات چیی پێ کردین؟ حەبەخان دەمی بردە لای گوێچکەی ئەحمەدەوە و بە چرپەوە گوتی بە خوا هەزار جنێوی داوە بە خاڵە مچە و گەلێ دوعاشی لێ کردووە. ئەحمەد گورج هەڵی دایێ و گوتی بۆ بۆ دوور لەو. دوایی بە زەردەخەنەوە گوتی ئاخر دایە ڕەعناشم هەقی بوو ئیشەکە زۆر کوتوپڕ بوو. ئەحمەد تۆزێ دانیشت و ئاوێکی خواردەوە و هەستایە سەر پێ و گوتی با بڕۆم سەرێکی ماڵی مامە عەلی بدەم. دایکی بە خۆشییەوە گوتی ئەرێوەڵا لە دەورت گەڕێم تاکو دێیتەوە منیش نانەکەت بۆ حازر ئەکەم. ئەحمەد گەیشتە بەردەرگای ماڵی حاجی عەلی، بەڵام هەستی کرد کەوا دڵی کەوتە پەلەپەل و دەمولێویشی خەریک ئەبوو وشک ئەبوون. دوو سێ جار تفەکەی قووت دا و تۆزێ ڕاوەستا ئینجا لە دەرگاکەی دا.
دایە ڕەعنای کردییەوە و کە دی ئەوە ئەحمەدە پەلاماری دا و هەردوو دەستی لە مل ئالاند و کەوتە ماچکردنی و بە شەوق و

خۆشـــییەکی زۆرەوە گـــوتی یـــاخوا بەخێـــر بێـــی ئەوە کەی هـــاتی؟ ئەحمەدیش بۆی گێرایەوە کە هاتنەکەی چۆن بووە. ئیتر بە هەڵەداوان چـوو بـۆ لای مـامە حـاجی عەلـی و پەلامـاری دەسـتی دا و بە گەرمـی هەواڵـی سـیحەتی پرسـی. ئەویـش کەوتە سـەرولامل مـاچکردنی و دوو سێ جـار حـاجی گـوتی ئەوە کـوا خـونچە؟ خـونچە وەرە ئەمە ئەحەیە هـاتەوە. خـونچە لە سـەرێ لە ژووری خۆی بـوو گوێی لە غەڵبەغەڵب و دەنگێکی ئاشنا بوو، بە پەلە سەرپۆشـەکەی لە مل ئاڵاند و بە هەڵەداوان هـــاتە خـــوارەوە و کـــردی بە ژووردا و بە پەرۆش و زەردەخەنەی لە گـوڵ جـوانترەوە پەلامـاری دەسـتی ئەحـمەدی دا و دەسـتی یەکتریـان گوشی و بە گەرمی و بە پەرۆشەوە هەواڵی یەکتریان پرسی.
هەموویان دانیشتن، حاجی عەلی شـتی لـێ ئەپرسـی، دایە ڕەعنـا باسـی خـۆی بـۆ ئەگێـڕایەوە کە هـاتەوە لە هەڵەبـجە و گوتیـان ڕۆیشـتووی چیی کردووە، خونچە باسی ئەوەی بۆ کرد کە چەند گەڕەک و مـاڵ و دونیا چۆڵ بووە بەبێ ئەو و چۆن هەمیشـە ئەتگوت شـتێکی لـێ ون ببوو و هەر بۆی ئەگەڕا.
دایە ڕەعنـا هەسـتا بەلای نـان و سـفرەوە و گـوتی وا ئەچـم نانـت بـۆ حازر ئەکەم هێشتا گەرمە هەر ئێستە خواردوومانە. خونچەش هەستا بەلای ســـەماوەر و چـــاوە. ئەحـــمەد ڕاپەڕی و گـــوتی وەڵا ئەزیەت مەکێشـن بە خـوا تێـر تێـرم و پێکەنیـی و گـوتی حەبـاویش چـاوەڕێم ئەکات و نانی بـۆ حـازر کـردووم قەینـاکە هیـی ئەو ئێسـتە تێکراوە بـا بڕۆمەوە ئێوارە دێمەوە تـاکو درەنگ لاتـان ئەبـم. دایە ڕەعنـای گـوتی دەی قەیناکا تاقەتی حەبە بۆڵەبۆڵکەرمان نییە. بەڵام ئێوارە بێیتەوە بۆ نانخواردن چاوەڕێت ئەکەین.
خـونچە هـات بەسـەردا کەوا ئەحـمەد خەریـکە بـڕواتەوە. ڕاوەسـتا و گوتی ئەمە چییە ئەوە بۆ ئەڕۆیتەوە حەی چ زوو؟
حـاجی عەلـی گـوتی قەینـاکـا لێـی گەڕێ گونـاحە حەبەخـان نـانی بـۆ حازرکردووە توخوا زۆری بیر ئەکرد با بچێتەوە بۆ لای. خونچە بە

تەوسێکی نادیارەوە گوتی ئەی ئێمە بیرمان نەئەکرد. ئێمەش بەشمان پێوەیەتی. ئەحمەدە داماو گوتی وەڵا بڵێم چیێ خۆ فەرقتان نییە بەڵام ئەوان نانەکەیان کردووە.
دایە رەعنا گوتی قەیناکا بەساقەت بم برۆ لە پەنای خوادا بی، بەڵام ئێوارە زوو بێیتەوە.
ئەحمەد ئێوارە گەڕایەوە ماڵی مامە عەلی و تاکو شەو درەنگ لەگەڵیان دانیشت. نوکتە و قسە خۆشەکانی خاڵە مچەی بۆ ئەگێڕانەوە. باسی سەفەرەکەی پێشووی بۆ ئەکرد بە تایبەتی باسی کابرای گۆرانیبێژ کە چۆن سەری گێژ کردبوون و خاڵە مچەش چۆن بێدەنگی کردووە. ئەوانیش بەم قسەوباسانە ئەیاندایە قاقای پێکەنین و ئەکەوتن بە گازی پشتدا، بە تایبەتی خونچە سوور هەڵگەڕابوو و دەموچاوە جوانەکەی شەوقی ئەدایەوە زوو زووش ئەو دەستە ناسکانەی هەڵئەبڕی و ئەو دەم و لێوە ئاڵە و ئەو دانە مرواریانەی پێ دائەپۆشی، وەختێک کە ئەیدایە پڕمەی پێکەنین، خەڵک مەست و حەیران ئەبوو و نەیئەزانی چاو ببڕێتە ئەو دەست و مەچەکەی کە ئەتگوت هێلکەی پاککراون یان سەیری بازن و گوارە ئەنگوستیلەکانی بکات کە ئەتگوت ئەوانیش لە خۆشیياندا ئەوەندەی تر ئەدرەوشێنەوە، چونکە خاوەنەکەی ئەم جوانییەیە و چەند بەختیارن کە لەو دەست و پەنجە نەرمونیانانەدا جێگیر بوون. شەو درەنگ ئەحمەد گەڕایەوە ماڵی خۆیان، دایک و باوکی گەشابوونەوە. ئەحمەد بۆ ئەوانیش دانیشت هەندێ لەو قسە خۆشانەی کرد ئەوانیش دڵخۆش دەستیان ئەکرد بە پێکەنین. باوکی لە ژێرەوە بە چاوێکی پڕ لە خۆشەویستییەوە سەیری ئەکرد و بزەی چاوی ئەهات لە خۆشیياندا، بە تایبەتی کە ئەهاتە بەرچاوی ئەحمەد هەندێ قەڵەو بووە و شکڵیشی خەریکە ئەگۆڕێت و خەریکە لە پیاوێکی تەواو ئەچێت و پێش عومری ئەکەوێت.
وەستا قادر دەستی بە ڕیشەکەیدا هێنا و بە بڕوا و خۆشییەکەوە سەیری ژنەکەی کرد و گوتی چاوت لێیە شکور کوڕەکە چ کوڕێکی

ڕێکوپێکی لێ دەرچوو، پێم نەگوتی وازی لێ بێنە خۆ منداڵ نییە حەپسی بکەیت و بۆی بگرییت؟ دایکیشی بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە جوابی مێردەکەی دایەوە و گوتی ئۆ لە دەوری گەڕێم ئینجا ئەحمەدی من کەی ڕێکوپێک نەبووە، شکور هەر وا پیاو بووە. ئەحمەد پێکەنیی و هەستایە سەرپێ و دەستی برد پشتێنەکەی کردەوە کە ئیتر هیلاکە و حەز ئەکات جلەکانی بگۆڕێت و ئامادە بێت بۆ نوستن. ڕووی کردە دایکی و گوتی هەرکەسە ئەم پشتێنەم ئەبینێت ئەڵێت ئەوە ئەم قوماشە جوانەت لە کوێ کڕیوە؟ منیش پێیان ئەڵێم کورە باوکم پڕ بازارە دەمێکیشە هەمە. دایکی دەستی هەڵبڕی و گوتی بێچاوێنی بێ ئاخر زۆرت لێ هاتووە و هەستایە سەرپێ و بە پەرۆشەوە گوتی ئۆخەی با بیرم نەچێ بچم دوعاکەت بۆ بێنم کە ئەو جارە ئۆغرت کرد لە گیرفانی جلەکانتدا لە بیرت چووبوو. وای چەندم خەفەت خوارد و کەوتمە مەراقەوە. ئیتر بە پەلە چوو دوعاکەی بۆ هێنا و بە دەستی خۆی خستیە گیرفانیەوە و بە سنجاقێکی بچووک بۆی قایم کرد و دیسان سەرولاملی ماچ کردەوە و گوتی ئۆخەی ئێستە دڵم ڕەحەت بوو، باوکی پێکەنیی و گوتی ڕۆڵە خەریک بوو لەگەڵ عومەری ئۆتومبیلچی بۆت بنێرێت، دوایی گوتی نەء نایدەم بەو، چونکە سەرێکی هەیە و هەزار سەودا ئەترسم گومی بکات.

ئەحمەد دەستی خستە سەر گیرفانی باخەڵی کە دایکی دوعاکەی تیا قایم کرد و گوتی باشە ئیتر دڵت ئارام بێت و مەراقم مەکە، ڕاستت ئەوێت منیش وەکو خۆت لێ کردووە ماڵت ئاوا بێت بە خوا زۆر جار کە جلم ئەگۆڕی دەستێکم بۆ گیرفانم ئەبرد. چونکە ئەوەندەت پێ ئەگوتم ئاگات لێی بێت گومی نەکەیت ئیتر منیش وامدەزانی شتێکم لێ ون بووە. منیشت وا لێ کرد کە بڕوا بە سیحر و نوشتە بکەم و لەگەڵی ڕابێم.

دایکی دەستی دا بە سنگی خۆیدا و گوتی ئەیەڕۆ قوربانت بم وا نەڵێیت سیحر و نوشتەی چی ئەمە دوعایە، شێخێکی زۆر موبارەک

بۆی کردووی لەوساوە کە منداڵ بووی و کە تووشی کۆکە ڕەشە بووی دوور لە ئێستە و لەگەڵ پوورە ئاسکۆڵت تۆمان بردە مەرقەدی شێخ عیسێ و شێخ موسێ ئیتر ئەو شێخە موبارەکە ئەم دوعایەی بۆ کردی و شکور چاک بوویتەوە. دایکی پێکەنیی و گوتی ئەیەڕۆ منداڵی ئەم زەمانە ئینجا کوا بڕوا بە قسەی گەورە ئەکەن.
ئەحمەدیش پێکەنیی و گوتی ئەی ئەمە چییە بۆت هەڵواسیم و خستە گیرفانمەوە مەگەر پێت نالێم بیری ئەم پارچە کاغەزە نوشتاوەیەم ئەکرد و ئیتر چۆن بڕوام بە قسەت نەکردووە.
باوکی و خوشک و براکانیشی پێکەنین و هەریەکە قسەیەکی کرد. نەریمانە ئاژاوەچی لە ئێوارەوە هاتبووەوە ماڵی و لە ترسی ئەحمەد سەری خۆی کز کردبوو و خەریکی دەرسەکانی بوو. ئەحمەد چووە نزیکی و پەنجەکانی ئاخنییە ناو پرچی نەریمانەوە و ڕووی کردە جەماعەت و گوتی ها ئەم پاڵەوانە لە چیایە ئاقڵ بووە؟ هەر مەراقی ئەوم بوو. ئەحمەد جارێکی تر هەڕەشەی دەرنەچوونی لێ کردەوە. دایکی هەڵی دایە و گوتی ئۆ بە قوربانت بم هیچ دڵت لە لای نەبێت شکور ئەوەندە ئاقڵ و باش بووە شەو و ڕۆژ هەر خەریکی دەرسەکانیەتی هەر بووە بە کوڕێکی تر ئەوەتەی لێرە نیت دوور لە گیانت. ئەحمەد گوتی زۆر چاکە، بەڵام بۆی دامەپۆشە.
باوکیشی گوتی نە نە زۆر گۆڕاوە و زۆر باش بووە، پیاوە پیاو.
دوو خوشکە منداڵەکەی لە تەنیشت یەکەوە دانیشتبوون کە عومریان ٨ ساڵ و ١٢ ساڵ بوو سەیری یەکتریان کرد و بچووکەکە پێکەنیی و ئەوی تریان لە ژێرەوە دەستێکی تێوەژەند و شتێکی چرپاند بە گوێیدا.
ئەحمەد چاوی لێیان بوو زانیی شتێک هەیە و لێیان شاردووەتەوە و نەریمانی کەتنکەر دیسان هەر خەریکی بەزمەکانیەتی.
ئەحمەد سەیرێکی سەعاتەکەی دەستی کرد و گوتی ئۆهـ زۆر درەنگە دەی منداڵ هەستن لەبەر سبەینێ و مەکتەب نەئەبوو تاکو ئێستە

بەخەبەر بن بەیانی چوون زوو هەڵدەستن منداڵ ئەبێت زوو بنوێت و تێرخەو بێت.
ئەحمەد شەوباشی لە برا و خوشکەکانی کرد و پەلاماری خوشکە بچکۆلەکەی دا کە بە مەدحەکانی نەریمان پێکەنیی و گرتیە باوەش و گوتی ئای من زۆر بیری ئەم خرپنەم ئەکرد، ئێواران کە منداڵان لە مەکتەب بەرەڵا ئەبوون بیرم ئەکرد و ئەمگوت ئێستە شادە مەیموونیش بەربووە و وا ئەچێتەوە ماڵەوە. ئەحمەد دوو سێ ماچی کرد و گوتی خۆ کاکە نەریمان لێی نەداوی؟ شادان باوەشی کرد بە براکەیدا و سەری خستە سەرشانی و پێکەنی و گوتی با لە شەرمنییشی دا و پەنجەرەی عروسییەکەشی شکاند بە بەرد و پاڵێکی بە دایە ڕەعناشەوە نا و شەڕێ لەگەڵ دایەش کرد. شادان تفەکەی قووت دا و بە چرپە گوتی بەڵام بە باجی شەوبۆ مەڵێ دوایی ئەمکوژێت. ئەحمەد ماچێکی تری کردەوە و گوتی باشە گیان باشە دە ئیتر برۆ بنو دیارە خەوت دێت. ئەحمەد چووە ژوورەکەی کە ئیتر بنوێت و لەوێ دایکی خەریکی نوێنەکانی بوو. ئەحمەد سەیرێکی دایکی کرد و گوتی ئەرێ دایە کە من لێرە نیم بۆچی ئەم ژوورە وا چۆڵ بێت هیچ نەبێ با شەوبۆ و شەونم بێن لێرە بنون فەقیرانە جێگایان زۆر سەغڵەتە. دایکی دەستی برد و لێفەکەی بۆ ڕێک خست و گوتی ئەیەڕۆ ئەم قسانە مەکە بە خوا یارەبی تۆبە نازانم کێ بێت نایڵێم یەک شەویش لەسەر ئەم جێگایەی تۆ بنوێت.
ئەحمەد سەری با دا و گوتی ئاخر خۆ من لێرە نیم و ئەم ژوورە بۆ چۆڵ بێت، دوایی لە دڵی خۆیدا گوتی بەیانی ئەزانم چۆن ڕازی ئەکەم کە شەوبۆ و شەونم لێرە بنون.
بۆ بەیانی پێش ڕۆیشتنی منداڵان بۆ مەکتەب، شەوبۆی خوشکی هات خواحافیزیی لێ کرد و گوتی کاکە گیان خۆ ئیمڕۆ ناڕۆیتەوە؟ ئەحمەد گوتی نەء سبەینێ بەیانی زوو ئەڕۆین. شەوبۆ دڵی خۆش بوو و دەستی کردە ملی براکەی و خواحافیزیی لێ کرد ئەحمەد بە

زەردەخەنەیەکــی تەوســـاوییەوە جــوابی دایەوە و گــوتی ماشـــاءالله کاغەزی چاکت بۆ نووسیم و باسی دەرگا و پەنجەرەی چاکت پێ گوتم. شەوبۆ بە سەرسوورمانێکەوە دەستی کردەوە گوتی دەرگا و پەنجەرەی چی؟ ئەحمەد پێکەنیی و گوتی عروسییەکە شـەوبۆ سـەری داخست و تەریق بووەوە و لە ژێر لێوەوە منگەمنگێکی کرد ئەحمەد گــوتی جــارێ قەینــاکە بــڕۆ بــۆ مەکــتەبەکەت درەنــگ کە هــاتیتەوە قســـەیەکی لـــێ ئەکەیـــنەوە کە ڕۆیشتیشـــم لەگەڵ شـــەونم وەرن لە ژوورەکەم بنـــون، بەڵام دەســـت نەدەن لە کتێـــب و شـــتەکانم. دوای بەرچــایی ئەحمـــەد گلەیــی لە دایکوبــاوکی کــرد کەوا بە درۆ مەدحــی نەریمانیان کردووە.

دایکوباوکی بەیەکدا هـاتن و خەریـک بـوو ببێتە شـەڕیان ئەو ئەیگـوت خەتای تۆیە و زۆرت داوە بە دەمیەوە و چیی گوت بە قسەی ئەکەیت، ژنەکەش ئەیگـوت خەتـای تـۆیە تـۆ بەڕەڵات کـردووە و لێـی ناپرسـیتەوە مـن چـی بـکەم و چـی نەکەم هەمـوو ئەرک و چارەسـەرکردنی تەگەرەی مـاڵ و منـاڵ کەوتـووەتە سەرشـانی مـن و ئەوەتەی ئەحـمەد ڕۆیشـتووە دوور لە گیـانی مـن ئەمە حـاڵمە تـۆش هەر باکت نییە و هەر لە دەرەوە و لای ئاشناکانتی منیش ببم بە چەند کەرتەوە.

ئەحمەد لەم دەمەقاڵێیەی دایک و بـاوکی نـاڕەحەت بـوو و ترسـا لەوە بـیکەن بە شــەڕ بـۆیە هەڵـی دایە و گـوتی وەڵا بـابە گیـان ئەبـێ لەم عـومرەدا تـۆ جـڵەوی بگـری و ئاگـات لێـی بێـت بە نـاخێری ئێسـتە ئەو کوڕە گەورەی ماڵەکەیە.

باوکی گوتی کوڕم بڵێم چی بە مـن ئەکرێـت هەمـوو ڕۆژێـک تـێڵام بە دەســتەوە بێـت و قرەشــاتەمان گەڕەکـاوگەڕەک بـڕوات؟ مــن ئەڵــێم بەشـکم بە قسـەی خـۆش بـاش بێـت و نەختـێ شـەرم بکـات کەچـی تـا وای بۆ ئەکەیت ئەو زیاتر شووڵی لێ هەڵئەکێشێت.

ئەحـمەد گـوتی دەی گـوێ مەدەنــێ و خـۆتـان نـاڕەحەت مەکەن لەم عومرەدا زۆر مناڵ و هەرزەکار کەر ئەبن. دیسان شوکری خوا بکەن

بەس نییە شتی خراپتری نییە. مناڵ لەم عومرەدا خەیاڵ ئەداتە شتێک. هیی وا هەیە خەیاڵ ئەداتە زانین و خوێندن هیی وا هەیە خەیاڵ ئەداتە تۆپتۆپێن و یاری و ئەو بەزمە و هیی واش هەیە سەرسەری کۆلانان و فێری جگەرەکێشان و هەزار فیعلی خراپ ئەبێت. بەس نییە ئەم شکور هەر دڕ و شەقوەشێنە و هیچی تری نییە. باوکی گوتی بە خوا کوڕم کوڕ و منالّی ئەم زەمانە هەموو بە قسەی گەورە ناکەن و کەم کەس هەیە هاواری نەبێت بە دەستیانەوە. ئەحمەد دەستی دا لە ڕوومەتی دایکی و گوتی دە پێبکەنە موڕومۆچییت لێ نایەت، خەمی خراپتر هەیە، بەس نییە هەموو منالّەکانت فەقیر و بێدەنگن چاوت لە شەوبۆیە چەند بەحورمەتە هەموو هەر مەدحی ئەکەن و کوڕەکانی تریش چەند باش و ئاقڵن.

ئەحمەد هەستایە سەرپێ و گوتی با بچم سەرێکی مالّی مامە عەلی بدەم و خواحافیزی لە دایک و باوکی کرد و ڕۆیشت.

ئەحمەد کردی بە مالّی مامە عەلیدا دایە ڕەعنا و خونچە بە گەرمی بەخێرهاتنیان کرد، هەروەها حاجییش بانگی کردە لای خۆیەوە و ئەویش بە کوڵ و دڵ هەوالّی سیحەتی پرسی.

حاجی گوتی وەڵا کوڕم ئیمڕۆ زۆر باشترم بەڵام ئەڵێم با جارێ باش پشوو بدەم ئەو بەینە زۆر خۆمم هیلاک کرد. یەک دوو جار سەری هەڵەبجەم دا. ئەو ئاشنایەم شتێکی لێ قەومابوو وابزانم تۆش دیوتە نەبوو ئەو ساڵە چووین بۆ سەر شایی کوڕەکەی. ئەحمەد بیرێکی کردەوە و گوتی ئەی چۆن نەمدیوە، بۆچی ئەو شاییە هەروا بە ئاسانی لە بیر خەڵک ئەچێتەوە ئەوەندە خۆش بوو. حاجی گوتی ئا ئەوە ئەڵێ. ئینجا لەم ڕۆژانەدا هاتبوو بۆ لام کەوا کوڕەکەی گیراوە لەسەر قاچاخچێتی و بەشکم تکای بۆ بکەم کەوا ماڵە گیراوەکە هەمووی بۆ خۆیان تەنیا کوڕەکەی بەردەن. ئیتر بردمی لەگەڵ خۆی کە تکای بۆ بکەم لای حاکم و ئەوان، ئەوانیش باش بوو کاریان ڕاست بێت تکاکەیان قبووڵ کردم و کوڕەکەیان بەڕەڵا کرد. وابزانم

لەو ڕێگاوبانە سەرمام بوو. حاجی دەستی هەڵبڕی و گوتی ئیتر پاییزە درم و هەلامەت بەرۆکی خەڵک بەرنادات.
ئەحمەد جوابی دایەوە و گوتی ڕاست ئەفەرمووی هەر ئەوەیە هیلاک بووی و سەرمات بووە و بەڵام بە خوا هەق نەبوو وا خۆت ئەزیەت بدەیت. ئەوانە ئەوەندە تەماعن چاویان بە هیچ پڕ نابێت هەق نییە خەڵک گوێیان بداتێ خۆ چاوت لەو ماڵ و حاڵ و مەسرەفەیان بوو ئەوە چەند ساڵ لەمەوپێش ئەبێ ئێستە چۆن بن. حاجی بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی ئێستە دەوڵەتەکەیان لە حیساب دەرچووە. ئەحمەد بە تەوسێکەوە گوتی دیارە هەمووشی هەر بە قاچاخچێتی و دەستبڕین ئەگینا ئەوەتا دوکاندار و کاسب و خەڵکی وا هەیە لە بەیانییەوە تاکو ئیوارە بەسەر پێوە ڕاوەستاون و ئەرەق ئەڕیژن و شت هەڵئەگرن و شت دائەنێن بە هەزار فەلاکەت تاکو ئەتوانن ماڵ و منداڵی خۆیان ئیدارە بکەن. خونچە بە بێزارییەکەوە گوتی دە قسەیەکی تر بکەن و بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە گوتی بە خوا ئێستەش هەر بە پیاوە گۆرانیبێژەکە پێئەکەنم.
دایە ڕەعنا هەندێ سڵقی لە بەردەممدا بوو و خەریکی هەڵبژاردن و پاککردنی بوو و بەدەم ئیشەکەیەوە گوتی ئەوە بۆ کاکە مچە دیار نەبوو، ڕووی کردە حاجیی برای و گوتی دە بنێرە بە دوایدا با ئەو نیوەڕۆیە بێت بۆ ئێرە یاپراخیشمان هەیە حەزی لێ ئەکات، ئەحمەد بە خۆشییەکەوە سەیری دایە ڕەعنای کرد و گوتی هەر زوو زانیم یاپراخ لێ ئەنێیت. ڕەعناخان جوابی دایەوە و گوتی ئەی چۆن هاتووی بۆت لێ نانێم. کە لێرە نەبووی هەرچەند لێم ئەنا بە قوڕگمدا نەئەچووە خوارێ. ئەحمەد گوتی لەوانەیە خاڵە مچەش لای نیوەڕۆ سەربدات، پێکەنی و گوتی ماشاءاللەی لێ بێت سروەتی نییە تاقەت ناگرێت زۆر دانیشێت ها کە هات. دایە ڕەعنا بەدەم ئیشەکەیەوە لە ئەحمەدی پرسی و گوتی توخوا فاتمەخان چۆنە هەر وا نەخۆشە بەسەزمانە؟ ئەحمەد وەرامی دایەوە و گوتی وەڵا زوو زوو سەری

ئەدەم زۆری پێ خۆشە کە ئەچم بۆ لای. ئێستە باشترە وەکو باسی ئەکات هەر ئەوەیە قاچەکانی زۆر هێزیان نییە و ناتوانێت زۆر لەسەریان بڕوات ئەگینا لە ناوماڵدا زۆر باشە دێت و ئەڕوات و سەر و هەیکەلەکەشی زۆر ڕێکوپێکە. ئەحمەد پێکەنیی و گوتی قسەی زۆر خۆشە خەڵک ئەکوژێت لەبەر پێکەنین، وابزانم هەر بەو قسە خۆشانە ماوە ئەگینا خۆ بۆ دەرەوە قەت ناچێت مەگەر بە ئوتومبیل تۆزێ ناوشار ببینێت.

ئەحمەد بە شەوقەوە ئەو باسانەی بۆ ئەکردن و زۆر دڵخۆش دیار بوو، قسەکەی تەواو کرد و گوتی خاڵە مچەش خواحافیزی بێت، ئەڵێی خانەقای داناوە بیستوچوار سەعات ماڵەکەیان جمەی دێت لە خزم و کەسوکار.

ڕەعناخان گوتی ئۆ ڕۆڵە ڕووی زەمانە ڕەش بێت فاتمەخان وەختی خۆی ئەوەندە جوان بوو ئەوەندە ژنێکی بەحورمەت و لەسەرخۆ بوو کە خەڵک شوویان ئەکرد و ژنیان ئەهێنا ئەیانگوت ئەبێ فاتمەخان بووکەکە نیشانە بکات چونکە دەستی موبارەکە. کەچی ئێستە وا پەکی کەوتووە. ڕەعناخان قسەکەی تەواو کرد و جارێکی تر گوتی ئەی قسەی چەند خۆشە! ئەوە هەر مەڵێ. ئەحمەدیش بۆی سەندەوە و گوتی ئەرێوەڵا زۆر خۆشە. ڕەعناخان بەدەم سڵق بژاردنەوە گوتی پێی نەگوتی ژنت بۆ ئەهێنین؟ دە ژنێکی جوان بێنە!

خونچە یەک موچوڕکی ساردی پیا هات کە گوێی لەم قسەیە بوو و پێش ئەحمەد کەوت و نەیهێشت ئەو جواب بداتەوە و گوتی ئەیەڕۆ! ژنی چی وەڵا هەر ئەوەمان کەمە کەرکووکییەکی سڵقاوخۆرت بکات بە تووشەوە، نەکەی ها نەخەڵەتابی. ئەحمەد پێکەنی و گوتی ئینجا لە سڵق خۆشتر هەیە، بەڵام نەبابە ژنی چی و حاڵی چی. ئەحمەد هەستایە سەرپێ و گوتی خۆم هێشتا ژنم. ڕەعناخان پێکەنیی و گوتی ئۆ لە دەورت گەڕێم شکور پیاوی و زۆریش پیاوی. ئەوە فاتمەخان هەر وایە زۆر حەزی لە قسەی گاڵتەیە.

حاجی وتی ئەوە بۆ هەستای؟ ئەحمەد گوتی ئەڵێم سەرێکی ناوبازاڕ بدەم زۆری هاوڕێکانم لێم عاجز بوون ئەڵێن ڕۆیشتووی و پێت نەگوتووین. ئەحمەد بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی ئینجا بۆ من خۆم ئەمزانی هەر خاڵە گیان هات و وەک ڕەشەبا لوولی دام و بردمی! بڕواتان بێت لە ڕێگا بیرم کەوتەوە و گوتم بە ڕاست ئەمە چی بوو.

دایە ڕەعنا وەک هەڕەشە گوتی بڕۆ ها بەڵام زوو بێیتەوە لە دەرەوە و وردە و پردە نەخۆیت و خۆت تێر نەکەیت. ئەحمەد دەستێکی کردە ملی و گوتی وردە و پردەی چی چۆن! تۆ یاپراخم بۆ لێ بنێیت و من لە شوێنان شت بخۆم!

شەوێ خونچە هەر ئەمدیو و ئەودیوی کرد و خەوی زڕا هەرچەند ئەیکرد و ئەیکۆشا و چاوی لێک ئەنا کە بەشکم بنوێت و بەڵام لەپڕ قسەکەی ڕەعناخان و وتووێژەکەی دوێنێی لە گوێچکەدا ئەزرنگایەوە، ئەی پێی نەگوتی ژنێکی جوانت بۆ ئەهێنیێ؟ نەبابە ژنی چی خۆم هێستا ژنم! ئینجا لە سڵق خۆشتر هەیە؟! ئەرێوەڵا ئینجا سڵقاوخۆرێکت بکەن بە تووشەوە، نەخەڵەتابیت ها!

- ئینجا خۆ زۆر نزیکە و هیچ دوور نییە کە ژنی بۆ بهێنن بەو ماوە کەمەش چەند گۆڕاوە!

- ئێستە هەزار کچ حەیرانی ئەبن.

- ئینجا بۆ من وا پێم ناخۆشە عەیب و شوورەیی ئەحمەد تا دوێنێ منالێک بوو لەویا کەوتبوو خۆ بەوە نییە کە کەڵەگەت بووە و لە پیاوێکی تەواو ئەچێت، هەندێ کەس وادیارن پێش عومری خۆیان ئەکەون.

- نازانم ئەم خاڵە مچە زەهرەمارە لە کوێوە بۆمان هەڵقوڵا خێری نەنووسێت کوڕەکەی هەڵپێچا و بردی خۆزگە هەر لێرە بمایە هەزار ئیشمان پێ بوو خۆ حاجی عەلییش لە دڵدا پێی ناخۆش بوو ئەیویست کاسبیی پێ بکات. تازە ئەم خاڵە مچەیەشمان ئەوەندە خۆش ئەوێت ئەگینا یەکێکی تر بوایە لەوانە بوو پەشیمانمان بکردایەتەوە. بەڵام بۆ ئەم قەت دڵیان نایەت عاجزی بکەن حەواڵە بە خوا بێت.

– ئیشـەکەش زۆر باشـە. دەسـت کـێ ئەکەوێت؟ ئەوەتـا شـەماڵی بـرام چەنـد سـاڵە ئەخوێنێت ئـاخرییش بـوو بە مـوعەلیم و هەڵیـان دایە ئەو دێهاتە دووره مەعاشـەکەشی هەر بەشی سەفەر و سەرلێدانی دایک و باوکم و خواردنەکەی ناکات.

– بە چ مەعلوم ژنەکەی خاڵە مچە کچێکی خزمی خۆی ناکا بە ملەوە ئەوە نییە ئەڵێت کە ماڵەکەیان هەمیشە جمەی دێت.

– هیچ دوور نییە ئەحمەد خۆیشـی زۆر بەکەیف دیارە و هەر باسـی قەڵەبـاڵغی و قسـەی خۆشـی فاتمەخـانی ئەکـرد دیـارە چـونکە باسـی ژنهێنانی لەگەڵ ئەکات.

بە درێژایـی ئەو شـەوە ئەم قسـە و خەیـاڵانە وەک چەکـوچێکی زۆر قـورس ئەماڵـدران بە مێشـکی خـونچە و خەوەکەی لـێ ئەزڕانـد و ئەتگـوت نـوقمی دەریـایەکی بێبنـی نـاخۆش بـووە. ئیتـر خۆیشـی نەیزانیبوو کەی خەوی لێ کەوتبوو.

خـونچە بەیـانی خەبەری بـووەوە بێتـاقەت، هەمـوو لەشـی تێکشـکاو. زۆری لە خۆی کرد تاکو توانیی بێتە دەرێ لە ناو جێگاکەی.

ڕەعناخـان زۆر جـار پێـی دەگـوت گیـانە تـۆ بەیانیـان بە کەیفـی خـۆت هەستە. چاو لە من مەکە من لەگەڵ مریشک و کەڵەشێرەکان ئەنووم، لەگەڵ ئەوانیش هەڵەستم لە خەو. تۆ درەنگ ئەنویت ڕۆڵە گیان.

بەڵام خونچە ئەوەندە شـەرمن و بەحـورمەت بـوو پێـی عەیب بـوو کە درەنگ هەستێت لە خەو.

هەروەهـا حـاجیی مێردیشـی زۆر جـار پێـی ئەگـوت تـۆ بـۆ بـۆ خـۆت نانویت و ئیسراحەت ناکەیت، بۆچی وا زوو هەڵدەستیت.

چونکە حاجی خۆی بەیانیان نوێژەکەی ئەکرد و ئەنوستەوە.

خونچە گەلێ جار لە دڵی خۆیدا تووڕە ئەبوو و ئەیگوت وەڵا مردن ئەوەنـدە دانیشـتم و ئەوەنـدە نوسـتم. ئـاخر شـەو کـوڕ و کـچەکەم نەیانهێشـتووە بنـوم تـاکو بەیانیـان هەر بنـووم و هەڵنەسـتم بە زیـاد نەبێـت. ئەمـانیش هەر ئەوە ئەزانـن بڵـێن بنـو بنـو بنـو. خـونچە ئەو

بەیانییە کە هاتە خوارێ بێتاقەت و تووڕە دیار بوو. لە دەموچاو شتن بـووەوە و هـاتە لای ڕەعنـا خـان کە لەبەر سـەماوەر دانیشـتبوو و خەریکی بەرچایی حازرکردن بوو، خونچە بێدەنگ و بێزەق بوو. هەتا ئەو سـەروپرچە جوانەشـی هەر وا بە نـاڕێکی و بە شـێواوی سەرپۆشەکەی پیا دابوو و لە ملی ئالاندبوو. بەڵام هەر کەسێک ئەو بەیـانییە بەو حـاڵەش کە تیایـا بـوو وای ئەزانـی کە بە حەوت کەس ڕێکیان خستووە و سەروپرچیان داهێناوە و گوڵاوی دونیاشیان پیا کردووە و پەڕەی گوڵەباخیان بەو بەیانییە زووە لە ڕوومەت و کولم و لێوە جوانەکانی هەڵسووە.

خـونچە کـردی بە ژووردا و ڕۆژباشـی لە ڕەعناخـانی دشـی کـرد، ئەویش بە ڕوویەکی خۆشـەوە جوابی دایەوە و بە پەرۆشـەوە بۆی چووە پێشەوە و گوتی ئەوە چیتە خونچە گیان بێتاقەت دیاری دیسان گەروئالۆکەت نەبێ؟ خونچە گوتی وابزانم.

ڕەعناخان وەک دایکێکی دڵسۆز بە دەوروپشتیدا هات و بە پەرۆشەوە گوتی باشە ئێستە چیت بۆ بکەم گیانە؟ وەرە با جارێ شـان و ملت چەور بـکەم و بۆت بشـێلم و هـا ئەم سـرکەییەش لە ملـتەوە بپێچە و چایەکی گەرمیش بخۆرەوە، بەڵام نەء ڕاوەستە با بچم هێلکەیەکت بۆ دەڵەمە بکەم. بە گورجی ڕۆیشـت بەرەو چێشـتخانەکە و گوێی نەدایە خونچە کە بڵێ ئەخۆم یان ناخۆم.

ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو حـاجییش هـاتە خـوارەوە و سـەلامی کـرد و ڕووی کـردە خـونچە و بە زەردەخەنەیەکی خۆشـەوە گوتی ڕەعنـای خوشـکم بەم بەیـانییە زووە بۆڵەبـۆڵی چییەتـی دیسـان کـێ چیـی کردووە؟ خونچە جوابی دایەوە و گوتی هیچ نییە تۆزێ من نـاڕەحەتم وابزانم ئالووم کەوتووە ئەویش خەریکی داودەرمـانە، خـونچە بە زۆر پێکەنیـی و گـوتی ئیتـر دایە ڕەعنـایە کەس ناوێرێـت لەبەر ئەو بڵـێ تۆزێ نەخۆشـە ئەوەندە خـۆی نـاڕەحەت و هیلاک دەکات. حـاجی بە پەرۆشەوە ڕاپەڕی و گوتی دیسان ئالووتە؟ بە زاتـی خـوا ئەترسـم لە

مـنەوە تـووش بووبیـت. چەنـد جـار گـوتم مەیەرە نـزیکم تـۆ ئەیگـری بـا ڕەعنـای خوشـکم بێـت. حـاجی هـاتە نزیکـی و دەسـتی دا لە ڕوومەت و لاملی و گوتی نەء شکور گەرم نیت بڕۆ دانیشە لە جێی خـۆت هەڵنەسـی هەزار میـوان بـێن. ڕەعناخـان بە هـێلکە و قـاپ و کەوچـک و خوێـدانەوە هـاتە ژووریّ و هەردوو هـێلکەکەی خسـتە بەردەمـی خـونچە و بەدەم بـۆڵەوە گـوتی بـیقەزا بـن مـۆڵەتی کەس نـادەن خـوا نەیبـڕیّ بیسـتوچوار سەعات ئەڵێی چایخانەکەی حەمە ڕەقە ئەم ئەڕوات ئەو دێت وەڵا دوێنـیّ حیسـابم کـردووە ڕەنـگە دە جـار سـەماوەری تـازە کـردبێتەوە و پیـاڵەی شتبیّ و چای تێکردبیت. ڕەبی خوا زیادی بکات، بەڵام ئەوە کەی حاڵە؟

حاجی گوتی ئێجگار خەتای ئەم نەخۆشییەی من بوو.

خـونچە بە زەردەخەنەیەکـی دەسـتکردەوە گـوتی کـورە بـابە هـیچ نییـە تـۆزیّ بێتـاقەتم خۆتـان نـاڕەحەت مەکەن ماشـاءالله خـزم و کەس و ئاشـنا زۆرن و ئەگەر نەشـیەن گلەیـی ئەکەیـن و ئەگەر بێشـن هـیلاک ئەبین ئەی چی بکەن فەقیرانە. ڕەعناخان هەڵی دایە و گـوتی بەسـەری پێغەمبەر سەرم بە قوربانی سەری بێت نایەڵم ئەمڕۆ بێیتە خوارەوە.

خونچە پێکەنیی و گوتی ئاخر بۆیە کە نەخۆشی تەواویش ئەبـم لەبەر تۆ ناوێرم قسە بکەم ئەوەندە ئەیکەی بە هەرا.

خونچە سەیری ڕەعناخانی کرد و گوتی ئەی من بچمە سەرەوە چۆن دڵم دێت تۆ بە تەنیا بەجیّ بهێڵم، کیّ یارمەتیت بدات؟ ڕەعناخان گوتی هەر ئێستە زەکاوی باجی گوڵچین بانگ دەکەم. بـاجی گـوڵچین ئەمـڕۆ نەچـووە بـۆ نـانکردن ئەو بـوو بەیـانی زوو لە دەرگـاکەی دا و داوای تـۆزیّ گەڵای کـرد  و گـوتی ئەمڕۆ لە مـاڵم ئەمەویّ تـۆزیّ یـاپراخ لـیّ بنـێم، منـیش هەمـوو کەرەسـەی یـاپراخەکەی دوێنـێم دایـیّ. حـاجی و خوشکی ئەوەنـدە بە تەنـگ خـونچەوە بـوون و وا پەرێشـان بووبـوون، ئەتگوت کوڕی تاقانەیە و نەخۆشە.

خـونچە بە زۆری ئەوان هەسـتا و چـووە ژوورەکەی خـۆی و بەڵام هەر گوێی هەڵخستبوو چونکە ئەحمەد ئەبوو ئەو بەیانییە لەگەڵ خاڵە

مــچە بگەڕێــنەوە کەرکــووک. خــونچە لە ژوورەکەی هەنــدێ خــۆی خلافانــد بە جـل کـۆکردنەوە و جـل هەڵگــرتنەوە ئــاخری چــووە نــاو جێگاکەی و پاڵ کەوت.
چارەکێکی پێ چوو غەڵبە غەڵب و گرم و هوڕی خاڵە مچە و قاقاکانی دەنگی دایەوە لە حەوشەکەدا.
خـونچە ڕاپەڕیـی و زانیـی کە ئەوە هـاتوون بـۆ خواحـافیزی ئەی کـوا دەنگی ئەحمەد؟ لە دوای چاوترووکانێک ئەحمەدیش دەنگی پەیدا بوو.
حاجی گوتی دە تۆزێ دانیشن. خاڵە گوتی بە خوا درەنگە ئەبێ بڕۆین ئەی کوانێ خونچەخان؟
هێشتا قسـەکەی لە دەمـا بـوو خـونچە گەیشـتە لایـان. خـاڵە بە گەرمی هەواڵی پرسیی. ئەحمەد بە پەرۆشەوە گوێی گرت کە چی ئەڵێت.
خــاڵە کــردی بە گــاڵتە و پێکەنــین بە تــایبەتی کە بینیــی خــونچە لە نەخۆشــی تەواو ناچێــت لەبەر ئەوە مســتەکۆڵەیەکی لە حــاجی دا و گوتی هەمووی خەتای ئەم کـافرەیە و چەنـد قسـەیەکی بە مەعناشـەوە پێ گوت و جەماعەتی هێنایە پێکەنین.
خـونچە سـوور هەڵـگەڕا و تەریـق بـووەوە و سـەری داخسـت بەدەم زەردەخەنەیەکی کاڵ و کرچەوە.
ئەحـمەد هەردوو دەسـتی خـۆی هەڵگلۆفـت و ڕووی کـردە خـونچە و گوتی خوا نەکات ئینشاءالله هیچ نییە و دەمـی تـێکەڵ و پـێکەڵ بـوو و دوو سێ منگەمنگی کرد و دڵێ گوشرا و لە ژێرەوە سەیری خـونچەی کرد.
ئاخری ماڵئاواییان لێ کردن. ئەوانیش تا بەردەرگەی حەوشە بەڕێیـان کردن.
ئوتومبیلەکەیــان لەبەر دەرکــی مــاڵی ئەحــمەد ڕاوەســتابوو. خــونچە ڕانەوەســتا تــاکو بــکەونە ڕێــی و بە پەلە چــووە ســەرێ و لە نیــوە پێپلیکەکان چاوی سڕیوە لە فرمێسک و قوڕگی پڕ بوو لە گریـان و لە مناڵێک ئەچوو کە بە زۆر لە باوەشی گەرمی دایکیان دەرهێنابێت.

ئەحمەدیش تا کۆڵانەکەی بەجێ هێشت هەر ئاوڕێ دایەوە و سەیری دەرگای بەرماڵی خۆیان و مامە عەلیی ئەکرد و تاکو لە چاو ون بوون هەر چاوی تێبڕیبوون.

ئەحمەد بە پەرۆشەوە سەیری ئەمبەر و ئەوبەری کۆڵانەکەیانی ئەکرد کە ئوتومبیلەکەی پیادا تێئەپەڕی هەستی بەوە ئەکرد کە ئەم کۆڵانە چەند جێی گەورەیە لە دڵیدا و چەند یادگاریی هەیە لە ژیانیدا. ئوتومبیلەکەش لەسەرخۆ ئەڕۆیشت بە تایبەتی کە کۆڵانەکە بەردەڵان و نەختێ چاڵ و چۆڵ بوو بە دەست ئەحمەد بوایە و گاڵتەیان پێ نەکردایە خواحافیزیی لە گوێسەوانەکانیش و لەو دوو دەڕابە کۆنە شکاوانەش ئەکرد کە خرابوونە سەریەک لە پەنا دیواری ئەو کەلاوەیەی نزیکیان. بەوانیشی ئەگوت بیرتان ئەکەم و وا من ڕۆیشتم بەلام بە خوا هەموو دڵ و هۆشم لێرە و لەم شارە بەجێ ئەهێڵم.

ئەحمەد تاکو ماوەیەکیش وەک گێژ وا بوو.

لە ڕێگا یەک دوو جار خاڵە مچە پرسیاری لێ کرد و لە خەیاڵیدا دیسان ئەیوت بیکات بە شاهیدی ڕووداوێک بەلام هەر ئاگاشی لە قسەکانی نەبوو کە باسی چیی ئەکرد لەگەڵ کابرای تەنیشتی و ئەوەی لە پێشەوە دانیشتبوو دیار بوو خاڵە مچە و ئەوان زۆر ئاشنا و تێکەڵییان هەبوو هەروەها لەگەڵ ئوتومبیلچییەکەشدا. ئەحمەدیش جاری وا هەبوو کە خاڵە ئەیکرد بە شاهید بەبێ ئەوەی بزانێت باسی چی ئەکات ئەیگوت بەڵێ خاڵە گیان ڕاست ئەفەرمووی وا بوو. بەلام جارێکیان خاڵە مچە بەدەم کۆکە و پێکەنین و هەناسەبڕکیوە کە هەمووی تێکەڵ بە یەک بووبوون، ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی ڕۆڵە بە وەستا ئەمین بڵێ... وەستا ئەمینیش هەر قسەی خۆی ئەکرد و قسەکانی لە گلەیی ئەچوون. خاڵە مچەش بە گەرمییەوە بە ئیشارەت پێی ئەگوت کوڕە باوکم دە تۆ ڕاوەستە با منیش قسە بکەم ئەوەتا کوڕەکە شاهیدە. دیسانەوە ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی ئەرێ ڕۆڵە توسەری باوکت توسەری خۆشەویستت توسەری خاڵە مچەت بە

وەستا بڵێ و قسەی ڕاست بکە و شـەرم نە لەم بکە و نە لە ئەو ئەو ڕۆژەی فەردە چەڵتووکەکانیان هێنا لێخـوڕی لۆرییەکە ئێوارە هـاتەوە بۆ لام یان نەء. دەی قسـە بکە ڕۆڵە مـن هـیچ نـاڵێم! ئەحـمەد شـڵەژا و دەسـتەپاچە بـووو نەیزانـی بڵێـت هـاتەوە باشـە یـان بڵێـت نەهـاتەوە کامیان باشترە بۆ خاڵە مچە، چونکە ئەحـمەد نە چەڵتوەکی دیوە و نە لێخوڕی لۆریی چاو پێکەوتووە، ئەم خاڵە مـچەیە مەسـەلە و ڕووداوی وا ئەگێڕێتەوە کە هێشتا ئەو هەر نەچووبوو بۆ کەرکووک. دیـار بـوو کە خاڵە مچە شتیشـی بیـر ئەچوو. ئەحـمەد تۆزێ ڕاوەسـتا و وای لە خۆی کرد وەکو بیر بکاتەوە دەستی خسـتە سـەر نـاوچەوانی و گـوتی کـام ڕۆژ ئەفەرمـووی؟ خـاڵەمچە باسـی ڕۆژێ چەڵتووکەکـانی بـۆ کردەوە. ئەحمەد داما و سەیرێکی کرد و چاری نەمـا کە شـتێک بڵێت. ئەحمەد دەستی لەسەر ناوچەوانی لا برد و سەری ڕاوەشـاند و گـوتی بەڵێ چاک لە بیرمە هاتەوە بۆ لات. ئەحمەد دەسـتی خسـتە سـەر دڵـی و لە دڵی خۆیدا گوتی ئەی هاوار ئەترسم خاڵە مـچە نیازی نەهـاتنەکە بێت بەڵام خاڵە مچە دەسـتی دا بە یەکدا و یەک قاقـای لـێ دا و گـوتی هەی ڕووی دایـک و باوکـت سـپی بێـت ڕۆڵە بـاش بـوو تـۆم لەگەڵ بوویت تاکو وەستا بڕوام پێ بکات.

ئیتـر هەر وا ئەو سـێ و چـوار بەیەکـدا ئەهـاتن و مشـتومڕیان بـوو جاروباریش تۆزێکی ئەما کە وەک شەڕێ لێ بێت.

دیار بوو کە ئۆتومبیلچییەکە سەری گێژ بووبوو لەم قسـەوباس و ڕاز و گلەییانە لەبەر ئەوە ویستی قسەکەیان لە بیر بەرێتەوە و هەنـدێ بە دەنگێکی بەرز گوتی ئەرێ خاڵە گیان چەند ساڵە لە کەرکووکی؟ خـاڵە یەک قاقای بە دڵ و گیان لێ دا و گوتی بۆچی کوڕی بـاوکم ئەتەوێت تاریخ و مێژوو بنووسیت؟ لێخوڕەکە پێکەنیی و گـوتی بـۆ خـاڵە گیـان هەر حەز ئەکەم بزانم. خاڵە مچە گوتی بە خوا کوڕم ئەوەنـدە دەمێکە خۆشـــم لە بیـــرم نەمـــاوە. ڕەنـــگە ئەوســـا باوکیشـــت هەر لە دایـــک نەبووبێت. لێخـوڕی ئۆتـومبیلەکە بە سەرسـووڕمانێکەوە گوتی بۆچی

خاڵە گیان تۆ و باوکم کامتان گەورەترن. ماشاءالله وا دەرناکەوێت کە تۆ گەورەتری بێچاوێنی بێ هیچ پێتەوە دیار نییە.
خاڵە مچە پێکەنیی و گوتی بە خوا باوکتم دیوە بە باوەشی پوورە خورشیتەوە ئەو نۆبەرەی دایک و باوکی بوو باوکت لە هەموویان مناڵتر بوو.
لێخوڕەکە گوتی باشە خۆ تۆش مناڵ بوویت خۆ گەورە نەبووی ئەو وەختە؟ خاڵە مچە گوتی هەر دوانزە ساڵێک ئەبووم کەمتر نە زیاتر. لێخوڕێ ئوتومبیلەکە زۆر دڵی خۆش بوو کە نیازەکەی سەری گرت و خاڵە مچە مشتومڕی لە بیر چووەوە و وا کەوتە باسی ئەوسای کە چۆنن دایکی تاقە کچ بووە و باپیری خەڵکی کەرکووکە و کە چەند کچەکەی خۆش ویستووە ئیتر قسمەت و نەسیب کە داویانە بە شوو بە باوکی خاڵە مچە کە خەڵکی سلێمانی بووە و ئاشنای قەدیمی ماڵی خەزووری بوون. ئیتر دایکی خاڵە مچە بە بووکی براوە بۆ سلێمانی و لەوێ ژیاوە بەڵام باوکەکەی هەر چاوی لە دوو بووە، حەزی کردووە کە بێن و لە کەرکووک و لە نزیک خۆی بژین و هەر هەوڵی داوە کە بەشکم ئیشێکی باش بۆ زاواکەی پەیدا بکات تاکو بیهێنێتەوە کەرکووک و وازی نەهێناوە تاکو خاڵە مچەش لە دایک بووە و بووە بە سێ چوار ساڵ، ئاخری ئیشێکی بۆ پەیدا کردوون و هێناونی بۆ لای خۆی. ماڵێ باپیری خاڵە مچە و خاڵەکانی وەستا باشی و بەنای چاک بوونە و حاڵیان باش بووە ئاخری لە ئیمام قاسم و ئەو ناوە چایخانەیەکی بچووکیان بۆ باوکی خاڵە مچە کردووەتەوە وردە وردە چایخانەکەی گەشەی کردووە و گەورە بووە و بووە بە چایخانەیەکی بەناوبانگ و ئەم مسافرخانەیەی ئێستەش کە هەیەتی هەر ئەرز و زەوی ئەو وەستانە بووە. خاڵە بە گەرمی قسەی ئەکرد و ئەیگوت ئەو دەوروبەرە وەختی خۆی هەمووی هەر باخی سەوز و خەیار و سڵق و تەماتە بووە و ئێستەش ئەو سەوزە جوانەی کەرکووک هەر وا بەناوبانگە.

بە هاتنی ناوی سلّق ئەحمەد دڵی گوشرا و قسەکەی خونچەی بیر کەوتەوە کە وتی سلّقاوخۆرێکت نەکەن بە تووشەوە.
ئەحمەد تا ئەوسا خەیاڵ بڵاو بوو جار گوێی لە خاڵە ئەگرت و جار بە نوکتە و قسە خۆشەکانی پێئەکەنی یان دیسان ئەچووەوە سلێمانی و ماڵی خۆیان. بەڵام بە هاتنی ئەو قسەیەی و ئەوناوە ئەحمەد خۆی گورج کردەوە و دەستێکی برد بۆ سەروگوێلاکی و سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و پاڵی دایەوە و لە پەنجەرەیە ئوتومبیلەکەوە سەیرێکی ئەو دەرودەشتەی کرد و چاوی بڕییە ئەو گرد و شاخە دوور و نزیکانەی لێوەی دیار بوون و یان ئەو درەختانەی تووشیان ئەهات کەوا هەندێکیان پیاز و ڕەشەبا ڕووتەڵی کردبوو. جار بە جاریش زەلام و گوێدرێژ بە بارە دار یان بەرچنەی سەر گیراوی بە گژوگیای ئەبینی و سەرنجی ڕائەکێشا.
دایکی و دایە ڕەعنای بیر کەوتەوە کە چۆن پاییزان سەریان قاڵ ئەبێت و چەند بەرچنەی وایان بۆ دێت و ئەوانیش بە کوڵ و بە دڵ لێی کۆمەڵ ئەبن و خەریکی سرکە و ترشیات و دۆشاوی تەماتە گرتن ئەبن و خەریکی ساوە کوڵاندن و زەخیرە خستن ئەبن و چەند ئەبوڵێنن بە دەست داری تەڕەوە و لە داری وشکیش هەر بیانوو ئەدۆزنەوە، چۆن لەم بارە دارانە کەڵەکە ئەکەن بۆ زستان، ئەحمەد بەدەم ئەم خەیاڵانەوە زەردەخەنەی گرت و ساوەر کوڵاندنەکەی پاری بیر کەوتەوە کە دایکی و دایە ڕەعنای ئەیانکوڵاند و بە جام دانوولەیان بەسەر دراوسێیەکاندا دابەش ئەکرد و بە سەبە ئەیانبردە سەربان و چۆن لەو وەختەدا دوو پشیلە لەسەر گوێسەوانەکە پەلاماری یەکیان دا و یەکێکیان یەکسەر بەربووەوە خوارێ بۆ حەوشەکە و کەوتە ناو مەنجەڵی ساوەر کوڵاندنەکەوە. بەڵام خوا ڕەحمی پێ کرد بەوەی باش بوو پیشلە قوڕبەسەرەکە بەختی هەبوو کە مەنجەڵەکەیان بەتاڵ کردبوو وە تازە ئاوی ساردی تێکرابوو و لەسەر ئاگر بوو بۆ چینێکی تر، چۆن هەموویان و دەرودراوسێش

تاكو دوو سێ هەفتە هەر بەوە پێئەكەنین خونچە نەبێت كە دەستی كرد بە گریان و گوتی تۆزێ لەمەوپێش بوایە پشیلە قوڕبەسەرەكە بۆ خۆی ئەسووتا. ئەحمەد سەرێكی ڕاوەشاند و لە دڵی خۆیدا گوتی وای چەندە بەڕەحم و كچی چاكە. خەیاڵ بردی و چاكەكانی خونچەی ژماردنخاڵە چەند بەڕەحمە، چەند شەرمن و بەحورمەتە. توخوا بزانم هیچ عەیبی لێ ئەدۆزمەوە، باوەڕ ناكەم فریشتەش وەک ئەو بن. دڵپاک، لە جوانیدا بێوێنە، زۆر سەیرە بەم مانگەی كە دوور كەوتوومەتەوە لەبەرچاوم چەند گۆڕاوە ماڵ كاولە ڕۆژ بە ڕۆژ جوانتر ئەبێت. لەپڕ ئەحمەد هەستی كرد كەوا خەریكە زیاد پێی لێ هەڵئەبڕێت و خەریكە خەیاڵێ ئەچێت بە لایەكدا كە هەقی ئەو نییە و خەریكە لە سنووری ئەمینی و وەفا بەرامبەر بەو كەسەیە پێی ئەڵێت مامە گیان تێئەپەڕێت و ئەگاتە دەوروبەری ناپیاوی و سپڵەیی، بۆیە ئەحمەد هەر زوو دەستێكی هێنا بە دەمچاویدا و وەكو پیرەمێردەكان و بە دەنگێكی هەندێ بەرز گوتی اشهد ان لا الە الا اللە واشهد ان محمدا رسول اللە یا اللە خوایە گیان و دوو سێ قسەی تری تێكەڵوپێكەڵ كرد هەروەک ئەوە بوو كە بیەوێت ڕابكات و دڵ و مێشكی بشوات و پاک بكاتەوە لەم بیر و خەیاڵەی كە كردی بە خونچەوە. لە دەروونیدا وەک كفر و گوناهێكی زۆر گەورە بوو و لای وا بوو كە قەت نابێ ئەم باسانە و ئەم دیمەنەی خونچە ئەوەندە بە مێشكیدا تێپەڕێت.

خاڵە مچەش تا ئەوسا هەر خەریكی قسەی زەمانی پێشوو بوو و ئەوانەی تریش لەگەڵی تێكەڵ بووبوون ئەگەرچی ئەوان زۆر لە خاڵە منالتر بوو و ئەوەندە سەفەرەكەیان خۆش كردبوو كە هەر ئاگاشیان نەمابوو چەندیان ماوە و گەیشتوونەتە كوێ.

خاڵە مچە ڕوویەكی كردە ئەحمەد و گوتی ها ڕۆڵە گیان چیتە؟ خۆ ناڕەحەت نیت و دەستی خستە سەر شانی و ڕووی كردە ئەوانی تر و گوتی ئەم كوڕە قۆزە ئەبینن، ماشاءاللە چەند كوڕی چاكە، سەری

بـــا دا و گـــوتی ئەوەتەی هـــاتووە بـــۆ کەرکـــووک کەوتـــوومەتە ئیسراحەتێکەوە هەر قەت نەمدیبوو بە خۆمەوە. قاقایەکی خۆی ئاسایی لێ دا و گوتی ئەو هەتیو و مەتیوانەی لە لا من پێم فێر بووبوون هەزار فێڵیان لێ ئەکرد وایان ئەزانی خەڵەفاوم و شتم بیر نامێنێت. ئەحمەد زەردەخەنەیەک گرتـی و ڕووی وەرگێـرا و لە دڵـی خۆیـدا گـوتی بـۆ لەبیرچوون خاڵە گیان ئەوە سێ و دووی ناوێت. پیاوەکەی تەنیشتی گوتی دوور لە تۆ بەڵام بە خوا ئیشێکی باشت کرد هەقی خۆیەتی کاکە ئەحمەد هەموو خزم و ناسیاو مەدحی ئەکەن. ئەحمەد تەریق بووەوە و گوتی ئەوە چاکە و پیاوەتیی خۆتانە. باش بوو خاڵە مچە دیسان کردی بە هەڵا و نەیهێشـت ئەحـمەد دابمێنێـت و بیـری کەوتەوە کە یەکـێ مەدحی بکات چەندی پێ ناخۆشە، چونکە زۆر شەرمنە.

نزیک نیوەڕۆ خونچە هەستا و خۆی کۆ کردەوە دوای ئەوەی بۆ دووەم جار دایە ڕەعنای هاتە سەرێ، کەوا هەستێت شتێک بخوات و لە ترسی ئەوەی نەوەکو نانەکەی بۆ بێنێتە سەرێ و بۆ ئەوە ئەزیەت نەکێشـێت، ناچـار هەسـتا کە بێـتە خـوارەوە، بەڵام بە جارێـک دڵـی داخراو و گیرابوو.

نان تێکرابوو، خرابووە سەر سفرە و چاوەڕێی خونچەیان ئەکرد. خـونچە کـردی بە ژووردا و بە پەرۆشـەوە حـاجیی مێـردی هەواڵـی پرسی و جێی بۆ کرد لە تەنیشت خۆیەوە، ڕەعناخان لە قسە بەتەنگ و بووەکانی خۆی بۆ کرد. زەکاوی باجی گوڵچینی نانکەریان کە ئەویش لەسـەر سـفرە لەگەڵیـان دانیشـتبوو، کچێکـی چـواردە پـانزە سـاڵەی خرپنـی سـەوزە ڕەنگـی دەم هەراشـی هاروهـاج بـوو، زۆر خونچە و ڕەعناخانی خۆش ئەویست، چونکە هەروەک کچی خۆیان ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکرد و هیچ فەرق و جیاوازییان لەگەڵ نەئەکرد و زۆریـان یـارمەتیی خـۆی و دایکیـان ئەدا و هەمیشـە خـونچە بە چاوپێکەوتنی خونچە خۆشحاڵ بوو و ڕاپەڕی و بە دەمە هەراشەکەی گوتی یاخوا بەخێر بێی ماڵەکە بێ تۆ زۆر کشوماتە و خەریک بوو

تاقەتم بچێت دوو جار خەریک بوو بێم بۆ لات دایە ڕەعنا نەیهێشت و گوتی نوستووە نەچیت. زەکاو دایە پڕمەی پێکەنین و قسەکەی تەواو کرد و گوتی دوو جاریش بە دزیی ئەوەوە هاتم بۆ لات، بەڵام لە نوستوو ئەچوویت دڵم نەهات بانگت بکەم.
خونچەش سوپاسی کرد و گوتی ئەرێوەڵا وابزانم خەوم لێ کەوتبوو.
ئیتر کەوتنە نانخواردن. زەکاو هەروەک دەم و قسەی پەلە و هەراش بوو نانخواردنەکەشی زۆر خێرا بوو، بۆیە پێش هەموویان لێ بووەوە و قاپەکەی هەڵگرت و بردیە چێشتخانەکە و دەست و دەمی شت و گەڕایەوە لایان و چوو دانیشت لەسەر دۆشەکەکە و دەستی دایە کیسەیەکی کاغەز و کردیەوە و ڕووی کردە ڕەعناخان و بە پەلە و وەک دەستڕێژ گوتی دایە ڕەعنا ئەمە چییە؟ ئەم گۆرەوییانە هیی کێن لەم زەرفەدا؟ ئەمانە بۆچێ لێرە کەوتوون؟
ڕەعناخان کە لە نانخواردن بووبووە و وردەنانی بەردەمی خۆی کۆ ئەکردەوە جوابی زەکاوی دا و گوتی دای بنێ لە جێی خۆی بمرم یاخوا ئەوە گۆرەوییەکانی ئەحە گیان بوون من بۆم هێنابوو لە هەڵەبجەوە، شەوێ دامە دەستی کەچی لە بیری چووبوو و هەستایە سەرپێ و دوعایەکی لە خۆی کرد و کە بۆچی بەیانی هات بۆ خواحافیزی بیری نەبووە بیداتێ.
سفرە هەڵگیرا، خونچە چوو دەستوپلی شت و گەڕایەوە ژووری و دەستی دایە توورەکە کاغەزەکەی کە گۆرەوییەکانی تیا بوو، ئەویش دەری هێنا و سەیرێکی کرد و جارێکی تر خستیەوە ناو کیسەکە دای نایە سەر لێواری کوورەکە، جارێکی تریش دەستی بۆ برد و بە جوابی پێچایەوە و دای نایەوە ئەتگوت دەستی داوەتە شتێکی زۆر بەبەها و بەقیمەت، یاخود شتێکی زۆر نزیکی ئەحمەد کەوا بۆنی ئەوی لێ دێت هەرچەندە دوو سێ جووت گۆرەویی زۆر عادی و زۆریش هەرزان بوون، بەڵام ناوی ئەحمەدی پێوە لە لای خونچە بوو بە شتێکی زۆر بەبەها و بەقیمەت.

خونچە زوو زوو سەیری سەعاتەکەی دەستی ئەکرد و لە دڵی خۆیدا ئەیگوت ئاخۆ ئێستە ئەحمەد گەیشتبێت؟ ئێستە دەمێکە لە کەرکووکن. ڕەنگە یەکسەر چووبنە ماڵی خاڵە مچە. خواش ئەزانێت ڕەنگە ژنی خاڵە مچە سیانێکی بۆ دۆزیبێتەوە. ئەوە چییە ئەو ژنە وەکو ئەڵێن هەر باسی ژنهێنان و شووکردن ئەکات، ئەو هەقی چییە بەسەر خەڵکەوە، هەرچەند گوناحیشە بەڵام وەڵا ئەڵێی دوعای لێ بکەم لەوەش خراپتری لێ بێت. خونچە لەسەر دەنگی ڕەعناخان هاتەوە سەرخۆ کە چایەکەی خستە بەردەم و گوتی چاوت لێیە ئەوە پێم گوت ڕۆڵە ئەو دوو سێ پارچە جلە لەسەر تەنافەکە داگرە و بیبەرە ژوورەکەی خونچە، ئەوەتا چوو نەگەڕایەوە.
خونچە گوتی باسی زەکاوە ئەکەیت؟ ئۆ بەخوا ئێستە لەبەر ئاوێنەکە دانیشتوە پرچی دائەهێنێت. ئەو ڕۆژە دیسان چووبووە سەرێ و هەر نەهاتەوە خوارێ خۆم ناردبووم بە ئیشێکی زۆر بچووک و ڕۆژی میوانە زۆرەکە، کەچی دوای ئێوارە کە چوومە ژوورەکەی سەیر دەکەم هەموو شانەکەم پرچی ئەو بوو بۆی پیس پیس کردبووم.
حاجی پێکەنیی و گوتی خۆزگە هەر ئەوە بوایە، ئەو ڕۆژە چووم بەسەردا کە سەیر ئەکەم لەبەر ئاوێنەکە دانیشتووە و سەروکڵاوەکەتی کردووەتە سەر. منی دی ڕاپەڕیی و گوتی کاکە حاجی ژوورەکە کۆ ئەکەمەوە بۆ خونچە خان.
حاجی گوتی خەتای ئەو نییە خەتای خۆتانە و ڕووی کردە خونچە و گوتی بۆچی ژوورەکەت بە کراوی بەجێ ئەهێڵی و کڵاو و ئاڵتوونەکانت هەمیشە لەو ناوە کەوتوون. ماڵەکە هاوتوچۆکەری زۆرە خەڵک بۆ تووشی گوناه ئەکەن. خونچە گوتی بە ڕاستی کچێکی زۆر ڕووقایمە ئیتر ژوورەکەم دائەخەم من چووزانم ئەو ڕووی دێت بچێت وا بکات، پەنا بەخوا لەم خەڵکە. ڕەعناخان هەڵی دایە و گوتی ڕاستە هار و ڕووقایمە بەڵام بە خوا زۆر دەستی پاکە. خونچەش گوتی ئەرێوەڵا دەستی پاکە بەڵام ئەم ئیشە قۆڕانەی هەیە. حاجی

پێکەنیی و گوتی ئیتر مناڵە و تازە پێ ئەگات حەز ئەکات ئەویش شتی وای هەبێت گوناحە وازی لێ بێنن بەڵام ژوورت داخە با فێر نەبێت چونکە بۆ خۆی خراپە.
لەو کاتەدا زەکاوە دەم هەراش کردی بە ژووردا و گوتی خونچەخان شانەکەت دوو دانی شکابوو نەیخەیتە سەر من. من ویستم تۆزێ ژوورەکەت بۆ کۆ بکەمەوە. خونچە و طەعناخان و حاجی سەیری یەکتریان کرد. خونچەش گوتی قەیناکە گیانە یاخوا لەشت ساغ بێت. ڕەعناخانیش پێکەنیی و گوتی باشە دایکەکەم کارت ڕاست بێت وەکو ژوورەکەیت بۆ کۆ کردەوە.
ئەو ڕۆژە ماڵی ئەحمەدیش دیسان مات و مەلوول دانیشتبوون بەڵام زۆر لە جارەکەی پێشوو باشتر بوون و خەریک ئەبوون ڕائەهاتن. حەبەخان لەتاواندا ئەهات و ئەچوو و بەدەم ئیشەکەیەوە ئەیگوت قەی چی ئەکات هەر مەرگی نەبێت، ئەوەتا کەرکووک بستێکە خوا نەیبڕێ ئیشەکەی زۆر باشە لە دەوری گەڕێم، گوتی لەمەدوا زوو زوو سەرتان ئەدەم، تۆزێ ئەچووە ئەولاوە و لەپڕ دیسان باسی ئەحمەدی ئەکرد و ئەیگوت بە نەریمانیشی گوت هەر بوو بە تەحتیل ئەتبەم بۆ لای خۆم دەوروپشتمان هەموی سینەمای خۆشە، بۆ خۆت تێر سەیری سینەما بکە. شەوبۆ لەوێوە هەڵی دایێ و گوتی کاکە ئەحمەد گوتی ئەگەر ئیمساڵ لە مەکتەب دەرچوو و نمرەی باشی هێنا ئینجا.
شەوبۆ و خوشکە ١٢ ساڵەکەی شتەکانیان ئەگواستەوە ژووری ئەحمەد و ژوور و ماڵیان ڕێک ئەخست و فەرش و بەڕەیان هەڵتەکاند و پەنجەرە و بنمیچیان پاک ئەکردەوە. دایکیشیان بەین بەین ئەیگوت شتەکانی ئەحمەد گیان جوان هەڵگرن کەس دەستی لێ نەدات ئاگاتان لێ بێت.
شەوبۆ کچی گەورەی ماڵەکەیە بوو دوای ئەحمەد هاتبوو ئەسمەرێکی باڵا بەرزی چاو برد، خوێنشیرینێکی بێدەنگ و لەسەرخۆ

بوو عومری نزیک ١٨ ساڵ ئەبوو. شەوبۆ خۆی هەڵکردبوو. گسک و پەڕۆ و سەتڵە ئاو لەو ناوە کەوتبوون و لەگەڵ خوشکە ١٢ ساڵەکەی سەریان قاڵ بوو، ئاخری ئەحمەد هەموویانی ڕازی کردبوو کە ئەو دوو خوشکەی لە ژوورەکەی بنون.
شەوبۆ زوو زوو هاواری شەونمی ئەکرد کە بەردەستیی ئەکرد و هەر پێی ئەگوت دەی شەونم ئەو سەتڵە بێنە، ئادەی گسکەکەم بدەرە دەست، خێراکە بڕۆ ئاوی سەتڵەکە بڕێژە و ئاوی پاکی تێکە، دەی ئاقڵ ئەو نوێنانە بەرە ئەولاوە، ئۆخەی کچی چاک ئەو سندووقە هەنێ ڕاکێشە بەرپێی گرتووم، خێراکە خێرا ئەو پەڕۆیە بەرە بیشۆ زۆر قوڕاوی بووە.
دایکیشیان بەدەم ئیشەکانیەوە گوێی لێ ئەگرتن و خەیاڵی دابووە قسەی کچە گەورەکەی و شەکان شەکانی خوشکە بچکۆلەکەی بە دەستیەوە کە چۆن ناوکەڕێژی کرد ئەوەندە ئەیهێنێ ئەیبات و بە گیانە گیانە هەموو ئیشەکانی بەو منداڵە فەقیرە ئەکا. ئاخری دایکیان خۆی پێ نەگیرا و ڕووی کردە شەوبۆی کچی و گوتی ئەرێ ڕۆڵە خۆ تۆ ئەو منداڵە بەسەزمانەت کوشت کچم گوناحت ئەگات ئەوەتی لە مەکتەب هاتووەتەوە و کتێبی داناوە و تۆ بانگت کردووە بەملادا ئەیهێنێ و بەولادا ئەیبەی. شەوبۆ بە زەردەخەنەوە گوتی دەی قەیناکا شەونم کچی چاکە ئێستە لێ ئەبینەوە و ئیتر ئیسراحەت ئەکەین بۆ خۆمان.
دایکی لچێکی هەڵقورتاند و بە ئەسپایی گوتی پەنا بە خوا ئەم بەشەرانە بۆ وایان لێ هاتووە و لە خوا ناترسن، دە فەرموو ئەمە کچی ئاقەڵە بەڕەحم و باشەکە بوو. هەموو ئیشەکانی بەو منداڵە فەقیرە کرد و ئەوەندە هێنای و بردی و شتی پێ هەڵگرت ئیتر ئەبێ خەڵکی بێگانەی بێڕەحم چۆن بن!
ئەحمەد بە تەواوی نوقمی ئیشوکاری خۆی بوو. کەوتە ژوور گۆڕین و نوێن گۆڕین و سەرجێگا و نوێن چاککردن و کۆنە فڕێدان. هەندێ

جار وا ڕێ ئەکەوت لە وەختی کۆنە فڕێدانە خاڵە مچە لەوێ ئەبوو، یەک دوو جار خۆی پێ نەگیرا و گوتی ئەحمەد گیان وابزانم ئەو دوو پەتووەی ئەو لایە هێشتا حەیفن. یان ئەیگوت بڵێم چی بە خوا ئەم بەڕییە وەختی خۆی زۆر جوان بوو ئەمە و لەگەڵ دوانی تر لە هەورامییەک کڕیومن. هەروەها خاڵە لە سەرێکی تریشەوە حەزی نەئەکرد سەر لە ئەحمەد بشێوێنێ چونکە زۆر بە دڵ و بە گیان پەلاماری ئیشەکەی دابوو و لەبەر ئەوە زۆر جار کە خاڵە مچە لەوێ بوایە، وازیان لە شت و کۆنە فڕێدان ئەهێنا تاکو ئەچووەوە ماڵێ ئینجا ئەحمەد و کوڕەکان لە کۆنە و شڕە بەرئەبوون و هەموویان لە ناو ئەبرد و فڕێیان ئەدا. شاگردەکان ئەوەندەی تر ئەحمەدیان لا خۆشەویست بووبوو هەر بە شان و بالایاندا هەڵ ئەدا و ئەیانگوت کێ ئەیوێرا عەرەبانەی زبڵەکەی دەرئەهێنا و ئابڕووی حەوت باوکیشمانی ئەبرد و ئەیوت ئێوە بێدینن ئەزانن ئێستە ئەمە بەچەندە؟ ئا ئەم کورسییەی ئێوە فڕێی ئەدەن بە خوا هەر عەینی ئەمە ماڵی دانسازەکەی ئاشنام کڕیویانە بەوەندە و بەوەندە. ئینجا کێ ئەیوێرا بڵێ کوڕە باوکم خاڵە گیان ئاخر ئەمە کۆنە و جێگا ئەگرێت و مشتەری شەوی وا هەیە چوار جار پەتۆمان پێ ئەگۆڕن. ئینجا ئەوی تر پێئەکەنی و ئەیگوت دڵیشی چەند سەخییە و چەند دەستبڵاوە کەچی بۆ کۆنە و شڕە وا ئەیکات بە هەرا. ئەحمەد پێئەکەنی و ئەیگوت ئاخر کە پیاو چوو بە عومری وای لێ دێت، تێکڕا خاڵە مچە هەرچییەک بکات و بڵێ خۆشە نابێ کەسمان بێدڵی بکەین.

ماوەیەکی تریش بەسەردا تێپەڕیی مسافرخانەی مستەفا بوو بە ئوتێل مستەفا و بە ئینجانەی گوڵ و گوڵزار ڕازایەوە. پەردە هەموو گۆڕان، ژووری نانخواردنەکە گەورە بوو و چێشتخانەکەی خرایە سەر. چێشتخانە برایە ژوورێکی تر و ئەویش تازە بووەوە. لەبەر ئەوەی ئەم ئەرزە لە کۆنەوە خاڵە مچە لە باوکیەوە بۆی مابووەوە و لەبەر ئەوەی حەوشە و پەناوپاساری زۆری هەبوو، وردەوردە ژوورەکانی

پێ گەورە کران و ئوتێلەکەی پێ خۆش کرا و بە ماوەیەکی کەم بوو بە ئوتێلێکی بەناوبانگ، ئەحمەدیش هەر پێش عومری خۆی ئەکەوت و ئەوەندەی عومر و نیوی خۆی ئەهاتە پێش چاو لە عومری ٢٥ ساڵیدا مووی سپی کەوتە سەریەوە، ئەویش چونکە بە تایەفە وا بوون و سەریان زوو سپی ئەبوو. زۆر کوڕێکی سەرڕاست بوو گوێی نەئەدایە ئیسراحەت و هیلاکی، خۆی ئەبوو ئاگای لە هەموو شتێک بێت لە بچووکترین تا گەورەترین. لەو ماوەیەدا ئەحمەد چەندین جار سەری سلێمانیی ئەدا بە تایبەتی کە خۆیشی بوو بە ساحێب ئوتومبیل.

خاڵە مچەش هەر ئەگەشایەوە و سیحەتی چاک ئەبوو. ئەحمەد بووبوو بە هەموو شتێکی و بە هەموو کەس و کوڕی تاقانەی. خاڵە وای لێ هاتبوو وەکو مناڵ ئەبوو ئەحمەد پێی بڵێت ئەوە بخۆ باشە بۆت و ئەوە مەکە خراپە بۆت. جاری وا هەبوو خاڵە بە دزییەوە ئەچووە سەر دەعوەت و بە ترسە ترس شتێکی ئەخوارد، چونکە شەوێک خاڵە ئەوەندە شتی قورس و چەوری خواردبوو خەریک بوو بمرێت و نیوە شەو بردبوویانە خەستەخانە و تووشی ناڕەحەتیی دڵ بووبوو. بەڵام ئەحمەد ئەوەندە گوێی دایە و بە تەنگیەوە بوو خاڵە بۆ خۆی چاک بووەوە، سنگ و هەناسەی و هەموو شوێنێکی و دەمێ ساڵ بوو خۆی وا لەشساغ نەدیبوو.

لەدوای ئەو چەند ساڵەی کە ئەحمەد لە کەرکووک بوو، زۆر چاک بۆی دەرکەوتبوو کە ئەملاولای ناوێت خونچە بووە بە هەموو ژیانی و بەو بایە ئەژێت کە بەسەر خونچەدا تێئەپەڕێت. بەڵام ئەوەندەی خەفەت ئەخوارد و ئەوەندە تەریق و شەرمەزار ئەبوو لۆمە و سەرزەنشتی خۆی ئەکرد کە لەو ڕووەوە ژیانی بە جارێک لەبەرچاو تاریک بووبوو. هەندێ شەو بە تەنیا دائەنیشت و دەستی ئەکرد بە گریان کە چۆن لە دڵیشدا ئەو ناپیاوی و خیانەتە لە مامە عەلی ئەکات و هەموو دڵ و هەستی لای ژنی ئەو پیاوەیە کە چەندین ساڵە وەک

برازایەکـی خۆشەویسـتی خـۆی خۆشـی ویسـتووە و بەقەد بـاوکی بەتەنـگ خوێنـدن و مەکـتەب و خەرجیـی گیرفـان و جلـی جەژن و جەژنانەیەوە بوو و هەموو ساڵێک بە بیانووی دەرچوون و نمرەی چاکەوە چەندەها خەڵات و دیاریی داوەتێ. دایک و باوکی لەگەڵ ئەو پیاوە چاکە بە تایبەت دایە ڕەعنای هەر هەموویان ڕۆحیان بەسەر لەگەڵ ئەو پیاوە چاکە بە تایبەت دایە ڕەعنای هەر هەموویان ڕۆحیان بەسـەر سـەری یەکەوەیە و هەمیشـە وەک یەک خێـزان و یەک مـاڵ بوونە. ئەی ئەو ژنە بەحورمەتە؟ ژنی مێرددار و دوو عومری ئەوی هەیە و کە ئەو ١٨ ساڵ بووە کە شووی کردووە بە حاجی عەلی و هـاتووەتە گەڕەکەکەیـان ئەم دە سـاڵ بـووە و وەک وەڕویلـکە لە بەردەستیدا بووە و بۆ ئەملاو و ئەولای ناردووە ئێستە چۆن ئەبێ شـتی وا بکـات. ئەحـمەد بە دەیـان شـەو خەوی ئەڕزا و لە خـوا ئەپاڕایەوە کە لێی ببوورێت و بیبەخشێت کە ئەم گوناهانە ئەکات و ئەم خەیـاڵانە بەو ژنەوە ئەکـات و وا چـووەتە دڵـیەوە مەگەر مەرگ بتوانێت لە دڵی هەڵکەنێت. چەند جار کە ئەحمەد ئەچووەوە سلێمانی سوێندی ئەخوارد کە ئیتر نەچێتە ئەو ماڵە و خۆی بدزێتەوە لێیان بە بیانوویەک. بەینێکی زۆریش هەوڵی دا کە هەر نەچیتەوە بۆ سلێمانی. ئیتر ئەحمەد بە تەواوی سەری لێ شێوا. خونچەش تا ئەهات جوانتر ئەبوو و ئەتگوت گـاڵتە بە سـاڵەکان ئەکـات یـان ئەوان شـەرمی لـێ ئەکەن و بە لایدا تێناپەڕن و هەروەکو خۆی وا بوو ئەتگوت لە باخی جـوانی بەهـاری بێپایانـدا چەقیـوە. ئەم منـاڵانە گەورە ئەبـوون و ئەو هەر بە خـۆی نە ئەزانـی. یەکێکـی وەکـو زەکـاوەی بـاجی گـوڵچین کە خـونچە هـاتووە بە بـووکی ئەو چـوار پێنج سـاڵ بـووە کەچـی ئێسـتە ئەڵێـی ڕەفیـق و هـاوعومرن کە خـونچە بە ئاسـانی بیسـت سـاڵ لەو گەرەترە، ئەگەر ئەو وەختە کە شووی کرد منـاڵی ببوایە ئێستە بەقەد ئەو ئەبـوو. بەڵام خـونچە هەمیشـە تارمـایی کـزی و نـاڕەحەتییەک لە چارە و دەموچاوە جوانەکەیدا دیار بوو و هەمیشـە ئەتگوت بە زۆر

قسەی پێ ئەکەن هەرچەندە زۆری هەوڵ ئەدا کە خۆی تەبیعی پیشان بدات تاکو هیچی پێوە دیار نەبێت. زۆر جار کە خەوەکەی ئەزڕا و بیریکی لە خۆی ئەکردەوە و هاوڕێ و ئاشنای خۆی ئەبینی چۆن شوویان کردووە بە هاوعومری خۆیان یان چەند ساڵێک لە خۆیان گەورەتر و ئەوەتا هەموو منالیان هەیە و هەمیشە شەڕەشەقان و ئەبۆڵێنن و هیلاکن ئەگەرچی حاڵیان وەکو ئەم باش نییە و هەندێکیان کە کچە گەورەش بوون وەزع و گوزەرانیان هەر بە تەواوی باش نییە و تاکو کراسێک ئەکەن دوو سێ شەڕی لەسەر ئەکەن لەگەڵ مێردەکانیاندا. ئەگەر بتوانن پارچە ئاڵتوونێک بکەن ئەوا ئەبێ بە هەزار قەرز و قۆڵە و فرتوفێل بێت. هەندێکیان هەر لە ماڵی خەزووریانن و هەموو پێکەوە لە خانوویەکدان و هەمیشە شەڕ و زرموهوڕیانە ئەم حاڵە قبووڵ ئەکەن چونکە دەری ناهێنێ بچن بە جیا خانوو بگرن و مەسرەف بکەن. بەو هەموو نەبوونی و ژیانی پڕ شەڕەشەقی ئەو کەسانەوە لەگەڵ ئەوەشدا خونچە بەخیلیی پێ ئەبردن و لە دڵی خۆیدا ئەیگوت ئەوان خۆشتر ئەژین لە منی حەپس و دیلی ئاڵتوون و سورمە و فەرش و قاڵی و لەم ساردوسڕەی من نە کوڕ نە کچ هەمیشە ئەڵێیت لە ژووری خەستەخانەم کەوچک بێنە و حەب بەرە ئەمیان ڕۆژی سێ جار ئەویان ڕۆژی چەند جار. جاری واش هەبوو زۆر ڕقی لە دایک و باوکی هەڵدەستا و لە دڵی خۆیدا زۆر قسەی پێ ئەگوتن. بەڵام تێکڕا خونچە حورمەتی حاجیی مێردی ئەگرت و زۆر جاریش بەزەیی پیا ئەهاتەوە.

ئەگەرچی ئەحمەد تروسکەیەکی خستبووە ژیانیەوە و دڵی پێ ڕوون ئەبوو و ئەویش بۆی ڕوون بووبووەوە کە ئەحمەد تەنیا خۆشییەکە کە بە چاوپێکەوتنی و گوێ لە قسەگرتنی تام و گەرمییەک ئەخاتە ژیانیەوە. بەڵام ئەحمەد بەو چی؟ ئەم ژنی مێردار و دوو عومری ئەحمد و بە حەیا و حورمەت و ڕەوشت و خووی بەرز بەناوبانگە هەر چۆن ڕووی دێت لەگەڵ خۆیشی خەیاڵی وا بکاتەوە و بڵێت کەوا

بە نزیکی لە ئەحمەد هەستی ئارام و خۆشی و دڵنیایی ئەکات ئەمە چ قسەیەکە! ئەحمەد ڕەنگە ئەگەر بە خەوی شەوانیش شتی وا بزانێت ئیتر لەبەرچاوی بکەوێت و زۆر بە سووکی سەیری بکات و لەم خانمەی کە ئەوەندە قەدرەی ئەگرێت و وەکو خوشکی گەورەی خۆی سەیری ئەکات ببێتە پارچە پەڕۆیەکی بێقیمەت لە لای و ئیتر بێزیشی نەیەت هەر قسەشی لەگەڵ بکات. خونچە هەرچەندە ئەم خەیاڵانەی ئەکردەوە خۆی بە سووک ئەهاتە بەرچاو و تاکو ژیانی چەند ڕۆژ هەر وا مات و بێئارام ئەبوو.
بەیانییەکیان زوو لەسەر تەلەفۆن ئەحمەدیان بانگ کرد. ئەحمەد بە پەلە و بە دڵێکی داخورپاوە و لەبەر خۆیەتی گوتی خێرە ئەبێ چی بێ بەم بەیانییە زووە. بە شڵەژاوی پەلاماری تەلەفونەکەی دا بە تایبەتی کە زانیی لە سلێمانییەوەیە. ئەحمەد هەر بەو چاوترووکاندنە هەزار خەیاڵی خراپ بە مێشکیدا تێپەڕیی و بە دەمێکی تێکەڵ و پێکەڵ گوتی هەلەو کێ قسە ئەکات خێرە. دەی بڵێ کاکە. باشە باشە من گوێم لێتە گوێم لە دەنگتە تۆ قسەی خۆت بکە. چییە؟ من، من ئەحمەد... ئەحمەد لەپڕ دەستی شل بوو و دەستێکی گرت بە ناوچەوانیەوە و دوایی بێ ئەوەی سەیری ئەملا و ئەولای خۆی بکات، دەستی گێڕا و کورسییەکی ڕاکێشایە لای خۆی و خۆی بەردایە سەری و گوتی کەی؟ چۆن؟ هەی هاوار! باشە باشە. هەر ئێستە و تەلەفۆنەکەی دانا.
یەک دوو کوڕی ئێشکەری ئوتێلەکە بە دیارییەوە ڕاوەستابوون ئەوانیش بە پەرۆش و نارەحەتییەوە دەستیان خستە سەر شانی ئەحمەد و گوتیان توخوا کاکە ئەحمەد خێرە چی بووە؟ بۆ وا تێک چوویت؟ بەڵام بە ڕەنگی هەڵبزرکاوی ئەحمەد تێگەیشتن کە شتێکی خراپ قەوماوە.
ئەحمەد چاوی خۆی سڕییەوە لە فرمێسک و گوتی توخوا کاکە گیان یەکێکتان ڕاکەن بە خاڵە مچە بڵێن کەوا مامە عەلیم ئەم بەیانییە دڵی وەستاوە و عەمری خوای کردووە و با زوو حازر بێت وا هاتم بە دوایدا کە بڕۆین. ئەحمەد دەستەپاچە بوو نەیدەزانی چی بکات دوو

سێ جار چووە ژوورەکەی و هاتە دەرێ. کوڕەکان لێی کۆمەڵ بوون و دڵیان دایەوە و ئەویش بە دەمێکی تێکەڵ و پێکەڵ و بە شپرزەیی هەندێ ئامۆژگاریی کردن و بە پەلە لێی دا و چوو سواری ئۆتومبیلەکەی بوو و چوو بە دوای خاڵە مچە و پێکەوە کەوتنە ڕێ بەرەو سلێمانی، سەعات حەوتی بەیانی ئەبوو.

خاڵە مچە بە ناڕەحەتییەکی زۆرەوە دەستی دا بە یەکدا و گوتی هەی هاوار هەی هاوار و ڕووی کردە ئەحمەد کە لە تەنیشتیەوە لێی ئەخوڕی و دیسان گوتی ئەبوو بە ئۆتومبیلێکی تر بڕۆین.

ئەحمەد بێ ئەوەی ئاوڕ بدات لە خاڵە مچە گوتی گوێ مەدەرێ ئەتوانم لێ بخوڕم خەیاڵم لای لێخوڕین و ڕێگاوبانەکەیە.

خاڵە گوتی لای خوا حەیف نەبێت بەڵام بە خوا پیاوێکی فەقیر و پاک و بێوەی بوو. چەند ساڵە ئەیناسم و بەو هەموو حاڵە باشەیەوە ڕۆژێک ئەم کابرایە لە خۆی نەگۆڕا و دڵی کەسی ئەزیەت نەدا.

ئەحمەدیش سەری ڕاوەشاند و بە قوڕگێکی گیراوەوە گوتی ئەرێوەڵا بە خوا حەیف.

خاڵە مچە هەستی کرد کەوا ئەحمەد خەریکە ئەگری لەبەر ئەوە گوتی کوڕم تازە نایەتەوە بە خوا برایەکی زۆر خۆشەویستم بمردایە هەر ئەوەندە پێی تێک ئەچووم. ئیتر خۆت ناڕەحەت مەکە لێئەخوڕی با ئیتر باسی نەکەین.

ئەحمەد گوتی خاڵە گیان لە لێخوڕینەکەم مەترسە.

خاڵە گورج هەڵی دایە و گوتی نەڵێی لەبەر خۆم ئەترسم؟ من لەبەر تۆ ئەترسم و بۆ تۆ ناڕەحەتم من بەشی خۆم دونیام دیوە. هاکە منیش بەیانییەک هەڵنەسم وەکو حاجی عەلی.

ئەحمەد بە ناڕەحەتییەوە گوتی توخوا قسەی وا مەکە خوا نەکات و دوور لە تۆ. ئیتر بێدەنگ بوون و باسەکەیان گۆڕی.

گەیشتنە سلێمانی، ئەحمەد قۆڵی لێ هەڵکرد ئەرکی ئەو تەعزێیە گەورەیەی سەر شانی خۆی و هەموو تەکبیر و مشوورخواردنی جێ

و ڕێ و نانخواردن و خەڵک بەڕێکردن هەر ئەو بوو، ئەتگوت کوڕی تاقـانەی حـاجی عەلیـیە. تەعزێیەکـی وای بـۆ دانـا لە مزگەوتـی گەڕەکەکەیانە بۆ کەم کەس تەعزێی وا گیراوە.

بۆ ژنانیش هەر عەینی ئەوە لە ماڵەکەی حاجی خۆی لەوێش دایک و خوشکەکانی هەر بە پێوە بوون و خزمەتی ئەم خەڵکەیان ئەکرد و لە کەسی حاجی زیاتر بەپەرۆش بوون بۆی. هەر کەسە ئەچووە دەرێ لە تەعزێیەکە مەدحی ئەحمەد و دایکی و باوکی خوشکەکانیانی ئەکرد کە چەند بەوەفان و چی ئەکەن بۆ ئەو ماڵە و بۆ ئەو پیاوە مردووە.

دوای چـووونە سـەرقەبران بە چـوار ڕۆژ ئەحـمەد و خـاڵە مـچە گەڕانەوە سەر ئیشوکاری خۆیان.

لەو ماوەیەدا دایک و کەسی خونچەش دەوریان دا و هـاتن بۆ لای و بە نـۆرە لە لای ئەبـوون و دڵیـان ئەدایەوە. مـاڵی بـاوکی ئەحمەدیـش ئەتگـوت ماڵیــان گواســتۆتەوە ئەوێ و بە شــەو و بە ڕۆژ دەوری خونچە و ڕەعناخانیان چۆڵ نەئەکرد. خـونچەش زۆر دڵـی پڕ بـوو و زۆر ئەگریا و هەر زوو جلی ڕەشی لەبەر کرد و ئاڵتوون و مـاڵتوونی لە خۆی کردەوە. بەو جلە ڕەشانەشەوە ئەوەندەی تر جوان بووبوو. هەرچی کەسێک کە ئەهاتن بۆ لای هەمیشە چاویان تێبڕیبوو و دوان و سیان ئەکەوتنە چرپە و باسیان ئەکرد.

– کـچەکە ئەمە چـۆن بە دیـار ئەو مێـردەوە دانیشـتبوو ئەو هەمـوو ساڵە.

– بە خوا ڕەنگە هەر زوو شوو بکاتەوە. خوشکم هەزار کەس دەستی ماچ ئەکەن.

– ماڵ کاولە ئەڵیی بەفری کوێستانە بەو جلە ڕەشـانەوە هەر شـەوق ئەداتەوە و لێی بووە بە نەقش.

– سەیری بکە چۆن بە دڵ و بە کوڵ بۆی ئەگری.

– چۆن بۆی نـاگری تۆ ئەزانـی لە چ نـاز و نیعمەتێکدا بـوو. ئێسـتەش ماڵ و پارەی دونیای بۆ بەجێ هێشتووە.

- تۆ سەیرکە ئێستە چ بەختێکی بۆ ئەبێت. ئەم هەموو ماڵەشی دەست کەوت، خۆشی وا جوان ئێستە شوو ئەکاتەوە بۆ خۆی.
- پەنا بە خوا چەند ساڵە دیومە هەر عەینی خۆیەتی. کچێ عومری زۆرە کە هاتووە بە بووکی، نازدارم هێشتا نەبووبوو لە سکما بوو وا نازدار خوا نەیبڕێ دەزگیراندارە.
ئیتر دیسان بەینێکی باش خونچە بوو بەهۆی سەرقاڵی و ڕابواردنی ناسیاو و دەوروپشتی.
ئەحمەد بۆ چلەی مامە عەلی هاتەوە بۆ سلێمانی، ئەم جارە هەر خۆی بە تەنیا چونکە خاڵە مچە هەندێ سەرمای بووبوو ئەحمەدیش لەوە ئەچوو کە لە مردنی حاجی عەلی زۆر ترسابێت بۆیە هەر بەوەدا ئەگەیشت بە خاڵە مچە و باوکی بڵێت وا بکەن و وا مەکە ئەترسا نەوەکا ئەوانیش شتێکیان لێ بێت. ئەحمەد سەری خونچە و دایە ڕەعنای دایەوە. ئەوانیش هەندێ قسەوباسیان بۆ کرد و باسی کرێی دوکانەکانیان بۆ کرد و وەستا قادری باوکیشی کە وەکیلی هەموو شتێکی حاجی عەلی بوو، ئەویش هەندێ پرس و ڕای کرد و ئەویش بە گەرمی جوابی ئەدانەوە و پێی ئەگوتن کە چی بکەن و چی نەکەن و چی بڵێن و چی نەڵێن.
خونچە خانووەکەی کە تیای بوو مێردەکەی بە ناوی ئەوەوە نووسیبووی هەروەها خانوویەکی تریش لەگەڵ شەش دوکان کەوا لە کرێدا بوون ئەویش بۆ ئەو لەگەڵ ناوماڵەکەشی هەمووی بۆ خۆی.
هەروەها حاجی عەلی بەشی ڕەعنای خوشکیشی دانابوو و بەشی دوو بێوەژنی خزمیشی هەر لە بیر بوو. وەستا قادری باوکی ئەحمەدیشی بێبەش نەکردبوو. ئەحمەد گەڕایەوە کەرکووک دوای ئەوەی ڕای سپاردن کە هەر ئیشێک یان تەگەرەیەکیان کەوتە ڕێ خەبەری بدەنێ.
پێنج شەس مانگ تێپەڕیی و هەموو شتێک وەک خۆی لێ هاتەوە و هەرکەس چووەوە بەلای ئیش و کارییەوە خونچەش ئەم جارە

هەستی بە ژیانێکی ساردوسڕتر کرد لە جاران. کەلێنێکی زۆر گەورە کەوتە ڕۆژگاریەوە هەرچەند مێردەکەی پیر بوو و زۆر جاریش نەخۆش بوو بەڵام ماڵەکەی گەرموگوڕ کردبوو. هەمیشە میوانی بەڕێوە بوون. خونچە ئەتگوت تاقە گوڵیەتی و ڕووناکیی دڵ و دەروونیەتی هەرچەند سەیری بەژن و باڵای ئەکرد لە خۆشیاندا بزەی چاوی ئەهات. وا نازی ئەکێشا و وای ڕەفتار لەگەڵ ئەکرد هەروەک لەگەڵ منداڵێکی زۆر تاقانەی بکات. سەری زمانی خونچە بوو بنی زمانی خونچە بوو. ئەگەرچی زۆری شەرم بە خۆ بوو و لە پیاوە بەحورمەت و قەدیمیکان بوو کە بە تایبەتی بەرامبەر ژنەکەی هەرچەند خۆشی بویستایە لەبەرچاوی کەس قسەیەکی نەئەکرد کە بۆنی ناز و بازی لێ بێت لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەسی نزیک و دووریشیان ئەیانزانی کە چەند ئەم ژنەی خۆش ئەوێت و هەر بە چاوی عاشقی تەماشای ئەکات. خونچە لەپڕ خۆی دیت کە بە کەساسی لەو ماڵەدا کەوتووە لەجیاتیی ئەو هەموو ناز و لەقەب و وەسفەی مێردەکەی ئەیکرد و پێی بانگ ئەکرد و پێی ئەگوت و شەو و ڕۆژ پڕ گوێچکەی ئەبوو لەجیاتیی ئەمانە هەمووی ئێستە گوێی لە قسەی بەزەییپیاهاتن و وەیشی وەیشی خەڵکە کە پێی ئەڵێن و وەکو بێوەژنێک سەیری ئەکەن. جار بە جار ئەگەر کەسێک بیری کەوێتەوە و وا بڵێت توخوا با سەرێکی بدەین. لەبەر ئەوە خونچە زۆر زۆر نارەحەت بوو لەوسای و زۆر دڵی بە خۆی ئەسووتا و بەو هەموو حاڵە باشەشەوە خۆی بە کەساسی و دڵشکاو ئەبینی و هەمیشە چاوی پڕ بوو لە فرمێسک.

جار بە جار بیری لە ئەحمەد ئەکردەوە و لە دڵی خۆیدا ڕقی لێی هەڵدەستا و ئەیگوت تازە ئەوە هەر هیچ بەینیێ تر لەپڕ دێتەوە و خەبەری ژنهێنانیمان بۆ ئەهێنێت وەکو مژدەیەکی زۆر خۆش. خونچە ئاخێکی قووڵی هەڵڕشت و ئەیگوت تازە هەر ناویشی نابەم من لە کەویێ ئەو لە کوێ.

ئەو تازە پێ ئەگات ڕۆژ بە ڕۆژ ئیشەکەی لە گەشەکردندایە و ناوی هاتۆتە ناوی ناوان. هەموو هەر بە شان و باڵیدا هەڵئەدەن و خەریکە لە خۆشی ئەگۆڕێت، بەڵام خونچە دوای بەینێکی تر تووڕەبوونەکەی دائەمردەوە و ڕقەکەی لە بیر ئەچووە و ئەیگوت ئەیەڕۆ ئەوە کەی ئەحمەدی فەقیر لە خۆی گۆڕاوە؟ بسم الله ئەوە چۆن ئەو بوختانەم پێ کرد هەرچییەکی پێ بڵێم ڕەنگە ڕێی تێبچێت بەڵام لەخۆگۆڕین؟ بەسەزمانە خۆ ئەڵێی منداڵەکەی جارانە ئەوەندە سادە و خۆی بە کوڕی بچووکی ماڵەکە ئەزانێت. چەند گریا، چەند جار هات، چەند جار بە هەموو دڵێکیەوە چووە ناو ئیش و قڕە کرێچی و خەریکی کاغەز و سەنەدەکانم بوو. ئەوە بۆ هەندێ جار ئیش وا بێویژدان ئەبێت و هیچ چاکەیەکی لەبەرچاو نامێنێت؟ هەر بە تووڕەبوونێک ڕەنج و خزمەت و دڵسۆزیی ئەو کوڕە باشەم فڕێ دایە گۆمەوە. بە ڕاستی ئینسان خۆپەرستە. یەکێکی تر بوایە لەجیاتیی ئەحمەد لووتی خۆی ئەکردە ئاسمان و کلکی پشیلەی بە دەسڕ ئەگرت و ئەویش وەکو ئەوانی تر. قابیلە لە کوڕەکەی دایە ڕەعنا نزیکتر بێت بە حاجی خوا عافووی بکات. ئەو لە کن خۆی خوشکەزای بوو کەچی لە جێی خۆی هەڵنەئەستا و وەکو بێگانەکان دانیشتبوو ئەبوو سینی و نان بچێتە بەردەمی. ژنەکەشی لە ناو ژناندا لەو خراپتر بوو. کەچی دایک و باوک و خوشکی ئەحمەد و ئەحمەد خۆی چییان کرد.

به ڕاستی ماڵی چاک و بەخزمەتن و زۆریش دڵسۆزن.

وردە وردە خونچە چاکی و پیاوەتی و باشیی ئەحمەدی ڕیز ئەکرد لە بەردەمی خۆیدا و ئاخێکی هەڵڕشت و لە دڵی خۆیدا ئەیگوت، بەڵام داخی گرانم ئەم کەرکووکە هەموو شتێکی لە ئێمە تێک داوە. چەند خۆش ئەبوو ئەگەر لێرە بوایە بە ڕاستی قەت ڕقم لە کەس نەبووە کەچی ئێستا چەند ڕقم لەو خاڵە مچە حەواڵە بە خوایەیە.

ئەحمەد دوای پێنج شەش مانگێک خەفەت و ماتی و دڵ پڕییەکەی بۆ مردنی مامە عەلی ڕۆژ بە ڕۆژ خاوتر ئەبووەوە. کە ئەهاتەوە بیری

له دڵی خۆیدا ئەیگوت دەی خوا عەفووی کات بەس نەبوو بەشی خۆی عومری ڕابواردبوو و ئەوەتەی هەبوو تێروتەسەل و حاڵ باش بوو. ئەی بۆ ئەو کەسانە بڵێ چی کە تاکو ئەمرن هەر خەریکی ڕەنج و تەقەلا و ئارەق ڕشتنن بۆ پارووە نانێک و بە هەزار قوڕبەسەری تا ئیدارەی ماڵ و مناڵیان ئەکەن و لەژێر باری ئیشی قورس و لەبەر گەرمای هاوین و سەرماوسۆڵەی زستان پشتیان ئەچەمێتەوە و دەستوپلیان شەقار شەقار ئەبێت. ڕەنگە بە هەفتە گۆشت و برنج نەچێتە سەر لێویان و کە ئەشمرن هەموو تەعزییەکەیان دێتە سەر ئەوەی ئەو بەو ئەڵێتخاڵە

- خولەی حەماڵ، ئەڵێن مردووە فەقیرە.

- توخوا! ئەوە کەی؟ ئۆ قوڕبەسەرە.

یاخود یەکێکی وەک ئەم پیاوە ڕیشسپییە بەسەزمانە وەڵا هەموو جارێک سەرم دائەخەم و ڕووم نییە سەیری بکەم ئەوەندە پیاوێکی نەجیبە بەو پشتە کۆماوەوە و بەو عومرەوە هەموو ڕۆژێک دێت ئەم بەردوکانانە گسک ئەدات و ئەو خۆڵە پیسە هەڵدەگرێت و ئەیخاتە ناو عەرەبانەی خۆڵەکەوە.

ئەحمەد ئۆفێکی هەڵڕشت و گوتی ئا بۆ ئەمانە هەقە خەڵک ناڕەحەت بێت کە هیچ خێریان لەم دونیایەیان نەدیت لە زەحمەتکێشان زیاتر و ژیانێکی کولەمەرگی.

ئەحمەد شەوێکیان دیسان خەوی زڕابوو یەک دوو کتێبی گرت بە دەستەوە و چەند لاپەڕەیەکی خوێندەوە، بەڵام هەر خەوی لێ نەئەکەوت. ئاخری چرا بچکۆلەکەی ژێر سەری کوژاندەوە و چاوی لێک نا و هەوڵی نوستنی دا و بەینێکی خۆی مات کرد. لەپڕ هاتە خەیاڵی و مێشکیخاڵە تۆ بڵێیت خونچە شوو نەکاتەوە؟ مەعلوم ئێستە زۆر کەس داوای ئەکەن. ئینجا خۆ دوور نییە گەنجە و جوانە ماڵ و حاڵی باشیشی هەیە ئێستە هەزار کەس دەستیشی ماچ ئەکەن. ئینجا تۆ بڵێیت ڕازی بێت؟ چ زوو بۆچی چی بوو. بڵێم چی ئەگەر چی وا

دەرناکەوێت بەڵام ڕۆژێک هەر شوو ئەکاتەوە بە تایبەتی نە کوڕی هەیە نە کچ ئیتر بیانوو لەمە چاتر چییە. ئەحمەد خۆی هەڵگێرایەوە سەر تەنیشتەکەی تری و لە دڵیدا گوتی عەیب و شوورەیی لە نانی کەمە لە ئــاوی کەمە بە ڕاســتی ئەگەر وا بکــات زۆر لەبەرچـــاوم ئەکەوت. ئینجــا ئەو ســەگبابە کێــیە کە داوای بکــات و ئەم وا زوو شووی پێ بکات وەڵا گۆڕی باوکی دەرئەهێنم هەر بزانم کێیە هێشتا نەبووە بە ساڵێک کوێڕا. وەڵا ئەگەر شتی وا بکات دیارە ئەویش زۆر هیچوپووچە خۆ شەرت نییە هەر خەڵک جوان بێت ئیتر تەواو وەکو ئەڵێن هەندێ کەس وەک گوڵ وانە، بەڵام هەموو لەشیان هەر دڕکە. بە چــی مەعلــوم ئەمــیش وا نیــیە وا خــۆی فەقیــرۆکە کــردووە و بە مسقاڵ قسەی لە دەم نایەتە دەرەوە. خوا ئەزانێ چی لە ژێر سەردایە و چی لە دڵدایە وەکو ئەڵێ لە ئاوی مەنگ بترسە. شوو... شوو... هەر ئەوەی کەمە. ئەمە ژنەکە بــوو کە کەس ســێبەری نەئەبینــی. ئەحــمەد تــوورە بــوو و خەوەکەی هەر بە تەواوی زڕا و چــاوی ئەتگــوت بە حەوت ئــاو شــۆراوە. هەســتا و دانیشــتەوە و دەســتی بــرد چــرا بچکۆلەکەی داگیرساندەوە و تۆزێ ئاوی خواردەوە و دەستی برد بۆ غەزەتەیەک لە نـــاو کتێبەکـــانی ژێـــر ســـەری دەرهێنـــا و بە توورەبوونێکەوە کردیەوە و هەرچەندی کرد بۆی هەڵنەگێڕرایەوە، دوو سێ جار بە قایمی پیایدا کێشا و ڕێکی خستەوە دوایی دای نایەوە. لێفەکەی لەسەر خۆی لابرد و هەستایە سەرپێ و قاپووتەکەی دا بە شانیدا چونکە دونیا زۆر سارد و زستان بوو و چووە دەرێ لە ژوورەکەی و ئەوەنــدەی پــێ نەچــوو گەڕایەوە ژوورێ و هەر زوو چراکەی کوژاندەوە و خۆی کرد بە ژێر جێگاوە و بێدەنگ بوو. لەپڕ ئەحمەد دایە قاقای پێکەنین و گوتی بەخوا ئەمە شتێکی خۆشە ئەمەیە ئەڵێن دێ نەگەیی دووکەڵ گەیشت. خونچەی بەسەزمانی چی، شووی چی کێ باسی شووی کردووە. کابرا تۆ لە خۆتەوە بۆچی وا کردت بە هەرا لەباتیی ئەوەی بڵێی خوا ئەجری بداتەوە و بە خۆشی

بژێت خۆ تۆ لای خۆت خۆشت ئەوێت یان خۆشویستییەکەت.،. ئیتر ئەحەمەد دەمی داچەقاندە سەرینەکەیەوە نەک هەر بەدەم قسەکەی تەواو نەکرد، هەولێشی دا لە مێشکیشیدا نەگوترێ هەر خەریکی ئەمدیو و ئەودیو بوو خۆشی نەیزانی کە چۆن خەوی لێ کەوتبوو.

ئەحمەد تا ئەهات ئیشەکەی باشتر ئەبوو و ئوتێلەکەی خۆشتر ئەبوو و بەرنەئەکەوت وردە وردە لە ئوتێلیش تێپەڕی کرد و خەریکی شەراکەت و قۆنتەرات و ئەو ئیشانەش بوو خاڵە مچەش لە خۆشییاندا جێی بە خۆی نەئەگرت. هەمیشە دەستی بە دوعاوە بوو کە خوا ئەحمەدی بۆ بپارێزرێت و هەر بە تەواوی پاڵی لێ دابووەوە و نەئەچوو بەلای هیچ شتێکدا و پارە و حسابی بە پاکی و پوختی ئەخرایە بەردەستی. وای لێ هاتبوو کە زۆری ئاشنا و تاکو خزمی نزیکی خۆی بەخیلی پێ بەرن کە ئەمە چی بوو خوا ئەم کوڕەی بۆ نارد و وا ڕۆحی لەسەر فلسێکیەتی و وا بە دڵ و بە گیان ئەم هەموو ئیشانەی بۆ ئەبات بە ڕێوە سەیری بکە بە ماوەی ئەم چەند ساڵە چیی بۆ کرد. ئەو مسافرخانە هیچ و پووچە و بەو چەند ژوورە و بەو نوێن و کەلوپەلەی زەمانێ کە هێشتا خاڵە مچە گەنج و منداڵ بوو و خەڵک کە ئەچووە ژوورێ لەبەر بۆنی کەباب و پیاز و چەوری و ڕۆن دڵی تێک ئەچوو و ئەو هەموو ناڕیکییەی کە هەبوو نەتەزانی ژووری نانخواردن لە کوێیە و ژووری چێشتخانەکەش کامەتا، هەمووی ئەتگوت هیی دەوری بەردە. خاڵە مچەش خۆشی هەمیشە هات و هاواری بوو بە دەست شاگردەکانیەوە و ڕۆژ نەبوو شاگر بەیەکدا نەیەن و دەست نەدەنە یەخەی یەک و چێشت و هێلکەورۆن چا نەکەن بە سەری یەکدا. خاڵە مچە هەمیشە شپرزە و دەم بە گلەیی و بۆڵەبۆڵ بوو. خیزەی سنگی ڕۆژەڕێیەک ئەڕۆیشت. کۆکە هێزی لەبەر بڕیبوو ورگی ئەتگوت قەلایە لەبەر دەمیدا چین چین بەسەر یەکدا هاتبووە خوارێ. ئەچووە ماڵەوە هەر هاواری بوو ئەهاتە مسافرخانەکەی خراپتری ئەکرد. وا ئێستە ئەڵێی پاشایە و لەسەر

تەختە. جلی ڕیکوپێک. ورگی نەماوە و باریک و ڕێک بووە. کۆکە هەر نازانێت چییە ڕۆژی دوو پاکەت جگەرەی ئەکێشا ئێستە ئەحمەد جگەرەشی پێ تەرک کردووە. ئەوەندە خواردنی باش و بێچەوری و سەوزە و میوەی ئەداتێ هەر بووە بە پیاوێکی تر. دەوەرە توخوا خۆشی وای لێهات و ئەو مسافرخانە بۆگەنەش وای لێهات سەیری گوڵ و گوڵزاری بکەن سەیری بەردەرگا و پشت دەرگا بکەن هەر ئەڵێی قەڵای گوڵ و گوڵەباخە. ئەمەیە کە ئەڵێن یاخوا ئاخر خێر بێ وەرە لە کوڕی نەبوو خوا ئەم کوڕە باشەی کرد بە تووشەوە سەیری ئەو بەختە بکە. خەڵکیش کوڕی ڕاستەقینەی خۆی هەیە و بە هەزار دەردەسەری گەورەی کردووە و پێی گەیاندووە کەچی هەنێکیان خواخوایانە هەر لە باوکیان پارە بکێشنەوە و بەم دەست و بدە و دەست ماڵێ پرش و بڵاو بکەن و زەرەری لێ بدەن و زۆریشیان ڕەنجی دونیایان لەگەڵ داون کەچی هیچ و پووچ و بێعەمەل و خوێڕیی کۆڵانان دەرچوون. دەوەرە شەق لە داخی بەختی ئەم کابرایە.

ئەحمەد وا خەیاڵی دابووە ئیش و وا خۆی ماندوو ئەکرد ئەتگوت ئەیەوێت ڕابکات لە دەست خۆشەویستی و خەیاڵی خونچە و بەشکەم بەو خەریکبوون و ماندووبوونە ماوەی نەبێت کە ئەوەندە دڵ و خەیاڵی لە لای بێت و شەو و ڕۆژ لە بەرچاوی بێت. بەڵام ئەحمەد خەیاڵی خاو بوو چونکە کات و سات و چاوترووکاندن نەبوو خونچە لە مێشکیدا نەبێت یان دیمەنە جوانەکەی و زەردەخەنە شیرینەکەی و ماتی و دڵتەنگییەکەی لەبەر چاو نەبێت و دەروونی نەورووژێنێت و خەوی شەوانی نەڕزێنێت. لەبەر ئەوە ئەحمەد تا ئەهات پێش تەمەن و عومری ئەکەوت و سەری بە تەواوی مووی سپیی تیا دەرئەکەوت و ئەهاتە بەرچاو، بە تایبەتی کە خەریکی بوو نەختێکیش قەڵەو ئەبوو و لە کوڕە باریکەلە شەرمنەکەی ئەوسا پیاوێکی کامڵ و تەواوی لێ دەرچوو. هەر ڕاستییش وا بوو هەروەکو چەند ساڵ لەوەوپێش کە

تـازه هـاتبوو بۆ کەرکووک خـونچە پێـی گوتبـوو وریـا بە نەخەڵەتـابی سلْقاوخۆرێک نەکەن بە تووشتەوە، هەر ڕاست قسـەکەی خـونچە بـوو چـونکە خـزم و کەسـی خـاڵۆژن دوو سـێ کچیـان هەبـوو تەماعیـان کردبووە ئەحمەد و هەر کە سەری لە شوێنێک دەرکەوتایە ئەو مـاڵانە وا دەوریـان ئەدا هەر ئەوەنـدە نەبـوو کە بـیکەنە کۆڵیـان ئەوەنـدە خزمەتیــان ئەکــرد و خۆیــان لــێ نزیــک ئەکــردەوە و خەریکــی ماستاوکردن ئەبوون بۆی.

جاری وا هەبوو فاتمەخانی ژنی خاڵە مچە هەر بە ئاشکرا قسـەی ئەدا بە بەرگوێدا کە لەم کچە جوانانە کامیانت بە دڵە با بۆت بهێنـین. بەڵام ئەحـمەد لە کـوێ و ئەوان لە کـوێ، ئەحـمەد هەمیشـە دڵ و گیـانی لە سلێمانی بوو و بە دەوری خونچە ئەسووڕایەوە و دەردی مەسـەلەکە گوتەنی، دڵی یەکێک بوو ئەویش وەسیکە بردبووی، کچی چی و ژنـی چی و لە لای ئەحـمەد تەنیـا سـەیرکردنێکی ئەو چـاوە گەشـە مەسـتە بەخومـارانەی خـونچەی نەئەگـۆڕییەوە بە هەمـوو فریشـتە و پەریـی دونیا. ئەوەندە شێت و شـەیدای بـوو ڕۆژ بە ڕۆژ خۆشەویسـتییەکەی زیاتر کڵپەی ئەسەند و پەرێشانی ئەکرد.

دوو سـاڵ بەسـەر مردنـی حـاجی عەلیدا تێپەڕیـی، خـونچە بە تەواوی بێـزار بووبـوو لەو حـاڵەی کە تیـا بـوو و زۆر زۆر تـاقەتی چووبـوو. جـاری وا هەبـوو ڕقـی لە هەمـوو کەسـێک ئەبـوو، لە مـاڵی بـاوکیەوە تاوەکو دەوروپشتی خۆی. خەریک بـوو ئەحـمەدی لەبەرچـاو ئەکەوت و هەنـدێ جـار بەقەد دوژمنێـک ڕقـی لـێ ئەبـوو. بەڵام کە ناویشــی ئەهات، سەرتاپا موچڕکێکی ساردی پیا ئەهات و دڵی پەلەپەلی ئەکرد. تێکڕا لە دڵی خۆیدا گلەیی لێ ئەکرد. ئەیبۆڵاند و ئەیگوت بزانە چەند کوڕێکی بێ هەست و شعورە هەر بە جارێک ئێمەی بیر چۆتەوە و هەر نـایەت بە لامـدا. ناڵێت ئـاخر چـی ئەکەیـت چـی ناکەیـت و چـۆن ڕائەبوێری. بەڵام ئاخر چۆن ڕووی دێت قسەی وا لەگەڵ مـن بکـات و باسی وام پێ بڵێت لەبەر خەڵک و ئەم و ئەو چۆن شتی وا ئەکرێت.

- کوره بابە ئەحمەدی چی، لە کوێ، هەر ئاگاشی لە من خوا ئەزانێت، ئێستە بە چییەوە سەری قاڵە. ڕەنگە ئێستە لەجیاتیی کچیک دوان سیانێکی هەبێت.
خونچە ئەم خەیاڵانە لە مێشک و دەروونیدا ئەسووڕانەوە و لەپڕ پەرشوبڵاو ئەبوونەوە کە ئێوارە و شەو داهات هەموویان یەکیان ئەگرتەوە و بە کۆمەڵ ئەچوونەوە ناو مێشکی... جار جار دڵیان خۆش ئەکرد و هیوایەکیان ئەخستە دڵیەوە و تێکڕا و بە زۆریش خەویان ئەزڕاند و سەریان لێ ئەشێواند. بەیانییەکیان خونچە ناردی بۆ لای وەستا قادری باوکی ئەحمەد و پێی گوت کەوا زۆر بە پەلە حەز ئەکات چاوی بە ئەحمەد بکەوێت و زوو بێت بۆ ئێرە، چونکە هەندێ ئیشی پێیە و کاغەز و سەنەد و ئەو نەوعە شتانەی لێ گوم بووە کە بە خەتی ئەو نووسراون و بزانێت ئەحمەد چیی لە بیر ماوە لەو کاغەزە نوسراوانە. باوکی ئەحمەدیش هەر لە ماڵی ئەوانەوە تەلەفۆنی بۆ ئەحمەد کرد و گوتی کوڕم حەز ئەکەم سەرێک بدەیت و باسی کاغەز و ئەو شتانەی خونچەی بۆ کرد. ئەویش جوابی باوکی دایەوە و گوتی بەسەرچاو بە زووترین کات ئەگەمە لاتان، بەڵام هێشتا تەلەفۆنەکەی دانەنابوو، کە سەری سووڕما و لە دڵی خۆیدا گوتی سەنەدی چی و کاغەزی چی بە خەتی من نووسراون؟
ئەحمەد دڵی کەوتە مەراقەوە و گوتی وادیارە خونچە ئیشێکی کەوتۆتە بەر و ئەیەوێت پرسێک بکات و ئەم قسەیەی کردووە بە بیانوو.
- خوایە گیان، ئەبێ ئەو ئێستە چ بێت. ئەترسم داوایان کردبێت و بیەوێت شوو بکات. ئەحمەد شپرزە بوو و لەبەر خۆیەوە گوتی قسەی بێمەعنا، ئینجا خۆ من باپیری نیم پرسی وام پێ بکات وەڵا ئەگەر وا بێت هەر جوابیشی نادەمەوە و هەر زوو دێمەوە، چاوی دەرئەهات.
- لێرەوە من بانگ بکات وەڵا چییە خانم ئەیەوێت شوو بکات بە خێرێ پرس بە من ئەکات. ئەی دایک و باوک و براکانی چی، ئەڵێی نەچم. نەء گوناحە بەشکم شتێکی تر بێت.

– مـن بـۆ وا لە خـۆمەوە دیسـان شـێت بـووم و کەوتـمە جنێـودان؟
ئەحمەد ئەو شـەوە هەتاکو بەیانی خەو نەچووە چاوی. جار بە جار چـاوی ئەچـووە سـەریەک لەپـڕ خەبەری ئەبـووەوە و دیسـان تێهەڵئەچـووەوە و ئەم جـارە بێـزار ئەبـوو و هەوڵـی ئەدا کە بەشـکم بنوێ دیسان چاوی لێک ئەنا و هەر خۆی ئەبینی لە ناو عەینی بەزمدا وا تـووڕە بـووە و ئەشـیڕێنێ و ئەقیژێنـێ، ڕاسـت ئەبـووەوە سـەیری ئەکرد کە ئەمە خەوە.
هەرچۆنێک بوو ڕۆژ بووەوە و هەر زوو هەستا و خۆی بە پەلە کۆ کـردەوە و چـاوێکی بە ئوتـومبیلەکەدا گێـڕا و کوڕەکـانی ڕاسـپارد و هەروەهـا شـەویش خواحـافیزیی لە خـاڵە مـچە کردبـوو و خێـرا چـوو سـواری ئوتـومبیلەکەی بـوو و کەوتە ڕێ بەرەو سـلێمانی. هێشـتا چێشـتەنگاو بـوو کە گەیشـتە بەر مـاڵی خۆیـان. دایـک و بـاوکی گەشانەوە لە خۆشییاندا و تێر تێر دەستیان کردە ملی و ماچیان کرد. خوشـک و براکـانی لە مەکـتەب بـوون، ئەحـمەد هەنـدێ دانیشـت و پشوویەکی دا و هەستایەوە سەرپێ و لە باوکی پرسیی کە سـەنەد و کاغەزی خونچەخان چین و ئەو چییان لێ ئەزانێت. باوکی گوتی وەڵا ڕۆڵە من هیچی لێ نازانم هەر ئەوەندە ئەزانـم کە گوتی ئەو ئیشـانەم هەیە و ئەمەوێت ئەحمەد بە زوویی بگاتە ئێرە.
ئەحـمەد خـۆی گـورج کـرد و گـوتی باشـە بـا بچـم بـزانم بەڵام وەکـو بزانـی کەسـی غەریبی لـێ نییە، هـیلاکم تـاقەتی چـاک و چۆنیی زۆرم نیـیە. بـاوکی نەوەڵا هەر خۆیـانن، دایە ڕەعناشـت لە مـاڵ نیـیە لە شـەوەوە چـووە بۆ مـاڵی خەزووری، کـوڕەکەی ئەڵێن لەسـەر مـردنە. خونچەخان دوو خوشکی لە لایە و پوورە ئامینەی. ئەحـمەد دوو سـێ هەنگاو ڕۆیشـت و ئـاوڕی لە بـاوک و دایکی دایەوە و گوتی بـا بـڕۆم بزانم کـاغەز و سـەنەدی چـین. بەڵام بەنـد نـابم زوو دێمەوە و چـووە دەرێ و ڕووی کـردە مـاڵی خـونچە. ئەحـمەد هەروەک دوودڵ بێت لە دڵی خۆی گوتی ئەڵێی چی بـا جارێ نەچـم؟ لەوە ئەچـوو کە ئەترسـا.

بەڵام تـووڕە بـوو و گـوتی ئینجـا ئەوەی بـۆ چییە و یەکسـەر چـووە بەردەرگـاکە و لە دەرگـاکەی دا دەرگـا کـرایەوە و ئەحـمەد چـووە ژووریّ و سـەلامی لە پـوورەکەی خـونچە کـرد و هەواڵـی پرسـی. خوشکیشـی بە ڕاکـردن چـووە سـەریّ و گـوتی بـاجی خـونچە، کـاک ئەحـمەد هـات. خـونچە ڕاپەڕیـی و گـوتی توخـوا؟ کەی؟ بە شپرزەییەکەوە هاتە خوارەوە و بە دەستێکی تەزیوی لەرزۆک دەستی ئەحـمەدی گـرت و بە دەمێکـی تـێکەڵ و پـێکەڵ بەخێرهـاتنی کـرد و دانیشتن.

ئەحمەد زۆر بە گەرمی هەواڵی پرسی و چاک و چۆنیی لەگەڵ کرد. خونچە پرسیی کەی هاتی؟ ئەحمەد دەستی خۆی هەڵگلۆفت و گوتی دە دەقیقە ئەبێت.

خونچە داما و دەستی برد بۆ سـەر سەرپۆشـی و سـەری داخست و نەیزانی چیّ بڵیّ و شپرزە بوو و لە دڵی خۆی گوتی ئەیەڕۆ ئێستە مـن چـی بڵـێم؟ بـۆچی ئەو کـوڕە فەقیـرەم لەسـەر ئیشـی هەڵگـرت و هێنـام، ئێسـتە چیـی پیّ بڵـێم کـاغەزی چـی و سـەنەدی چـی؟ عەیـب و شوورەیی ئێستە چی بکەم. بڵێم وەڵا تاقەتت چووە و تۆش خۆشت ئەوێت، ئەگەرچی دوو عومری تۆشـم هەیە، بەڵام دەی هەستە مـارەم کە و بمهێنە! ئەوە بـۆ وا شـێت بـووم و نـاردی بەدوایـدا، دە فەرمـوو دەی ئەوە هـات خـانم گیـان! کـوڕەی بەسـەزمان لە کـویّ ئاگـای لەم کەین و بەینەیە. بەخوا ئێستە هەر حەیام ئەچێت. ئەحمەد هەستی بە شـپرزەیی و نـاڕەحەتی خـونچە کـرد و ویسـتی هەنـدیّ بیـدوێنێت، بەشـکم شـتێک بڵێـت و ئەویـش شـتێکی لـیّ تێبگـات چـونکە کەوتە مەراقەوە.

ئەحمەد دیسان دەستی هەڵگلۆفت و گوتی ئیّ ئێستە دایە ڕەعنام لە ماڵ نییە؟ خونچە وەک نیوە بیّ هۆشی لیّ هاتبوو، ئەرەقی ساردی دەردابـوو. دڵـی پەلەپەلـی ئەکـرد، قسـە و جوابەکـانی لە بزرکانـدنی نەخـۆش ئەبـوو. ئەحـمەد قسـەکەی دووبـارە کـردەوە و باسـی دایە

ڕەعنـای کـرد. خـونچە هەوڵـی دا کە نەختـێ بێـتەوە سـەر خـۆی و بتوانێـت خـۆی ڕاگرێـت و ئەوە بـوو بە دەسـتی خـۆی خـۆی خسـتە ڕووداوە نالەبارەوە هەر ئەمەی کەم بوو. بە زەردەخەنەیەکی ژاکاوی بێتیـنەوە گـوتی ئەرێـوەڵا فەقیـرە لە شـەوەوە ڕۆیشـتووە و وەکـو ئەشزانی ماڵی خەزووری حەمەسەعید نزیک ئابڵاخە و زۆر دوورە.

ئەحمەد گوتی بزانم بەشکم منیش سەرێکی بدەم. خونچە گوتی بۆ کەی ئەگەڕێیـتەوە؟ ئەحـمەد بە پێکەنینێکـی ئەسـپایی شـەرماوییەوە گـوتی وەڵا تـۆ ئەزانـی و ئیشـی تـۆ ئەزانێت تـۆ نـاردووتە بە دوامـدا. خونچە تێک چوو و گوتی نەمزانی وا زوو ئەتوانی بێیت... ئەحمەد بە زەردەخەنەوە گوتی چۆن ئیشی تۆ بێت و زوو نەیەم، ئەمە قسەیە؟

خونچە سەری داخست و گوتی زۆر سوپاس، چووزانم گوتم نەوەکو ئیشت زۆر بێت و دوایی لەسەرخۆ بێیت. ئەحمەد گوتی ئەمە قسە بوو کردت؟ کە ئیشی تۆ هاتە پێشەوە هەموو ئیشێکی تر ئەکەوێتە لاوە.

خونچە تۆزێ گوڕی دایە خۆی و دڵی خۆی قایم کرد و گوتی باشـە کەواتە ئێوارە حەز دەکەیت وەرەوە جارێ هیلاکی، ئێستە سەرت گێژ ناکەم.

ئەحمەد پێکەنیی و گوتی خەمی سەری منت نەبێت ئیشت چییە حەز ئەکەم زوو بزانم.

خونچە گوتی نەء، دوایی باشترە. ئینجا لەپڕ وەکو بیری بکەوێتەوە خـۆ ئەحـمەد لە سـەفەرەوە هـاتووە ئـاخر ئاوێـک چـایەک و هەسـتایە سـەرپێ و گوتی بە ڕاست چی ئەخۆیتەوە؟

ئەحـمەد گـوتی ئەزیەت مەکێشـە. دایکـم شـتی بـۆ حـازر کـردووم و هەسـتایە سـەرپێ و گـوتی کەواتە بـا ئێسـتە بـڕۆمەوە و خواحـافیزیی کـرد و ڕۆیشـت. ئەحـمەد سـەری سـوورما بـوو لە وەزع و دیـمەنەی خـونچە چـونکە زۆر پەشـێو و نـاتەبیعی هـاتە بەرچـاوی. دیسـانەوە کەوتە گۆمی مەراقەوە و خەیـاڵ بردی و خەیـاڵ هێنـای. ئێوارەی لـێ بوو بە ساڵ.

– ئاخ خۆزگە ئێستە بمتوانیایە پێی بڵێم کە چەندم خۆش ئەوێت و چەند ڕۆح و گیانم بە تاڵێکی مووی سەریەوە هەڵواسراوە و ڕووم بهاتایە و لەبەر لۆمە و تیرتوانجی خەڵک و قسە و قسەرۆکیان بموێرایە بمگوتایە ئینجا چیی تیایە ئەگەر شوو بکەی بە من قەی چی ئەکات لە من گەورەتری. خۆ بە خوا کەس لە ٢٥ زیاترت بۆ دانانێت. خەڵک هەقی چییە بەسەرەوە. من پێم خۆشە و خۆم ڕازیم و مەمنوونم خەڵک با هەر بڵێن بۆ خۆیان.

– حەی بزانە هەر یەکسەر باوکم دڵی ڕاناوەستێت و دایکم یەخەی کراسی دانادڕێت؟ بۆ دوایی کون ئەبێت خۆمی تیا بشارمەوە؟ خاڵە مچە هەر ئەمکات بە کێوا.

– ئەم خەڵکە زۆر سەیرن چەند حەز لە قسە ئەکەن و قسەی زل ئەکەن، هەر خواخوایانە گوێیان لە قسەیەکی بچووک بێت تا سەد ئەوەندەی تری بخەنە سەر و پێی ڕابوێرن و گوێ نەدەنە دڵی کەس. دڵی ئەو کەسانەی ئەسووتێن و ئەتوێنەوە بە بێدەنگ و بە دزییەوە لە ترسی چەنەبازیی خەڵک و لە ترسی ئابڕووی خۆیان.

– بەڵام من لە خۆمەوە چی ئەڵێم. کێ ئەڵێت ئەگەر خونچە هەر زانیی خەیاڵی وام لە دڵدایە هەر بە دەرکردن دەرم ناکات و سەد قسەی خراپم پێ ناڵێت. ئەمەیە کە ئەڵێن لە وڵاخی نەبوو ئاخوڕی هەڵبەست ئەشهەدوبالله ئەمە لە من ڕووی داوە.

خونچەش سەری لێ شێواو بوو هەر ئەهات و ئەچوو و سەرکەوتە سەرێ و جێی بە خۆی نە ئەگرت و ئەهاتەوە خوارێ. زۆر تووڕە و نارەحەت دیار بوو. یەک دوو جاریش قیژاندی بەسەر خوشکە بەسەزمانەکەیدا کە بە خێرێ هاتبوو لەگەڵ خوشکەکەی تری ماڵی بۆ کۆ بکەنەوە و کەلوپەلی بۆ ڕێک خەن.

دیار بوو ئەوانیش لێیان نەئەگرت، چونکە حاڵ و وەزعیان ئەزانی کە چەند دڵی تەنگە و شەڕ ئەفرۆشێت. خوشکی بەسەزمان لە کوێ ئەزانن کە ئەو شێتی ئەحمەدە و ناوێریت بڵێت و دەری ببڕێت و

باسی بکات و خەریکە ئیتر حەیای لێ هەڵئەگیرێ و ئەوە نییە ناردوویەتی بە دوایدا و نازانێت چیی پێ بڵێت و ئەیەوێت ئەم داخە کوشندەیەی لە دڵی خۆی دەربێنێت، ئیتر گەر بە سووکی سەیری ئەکەن قیروسیا. خونچە مێشکی بە جارێک شێوابوو.

– باشە ئاخر ئەم کوڕە بۆ نەچێت کچێکی وەکو خۆی و بەپێی عومری خۆی بێنێت. چی لە منی بێوەژن ئەکات و دوو عومری ئەویش سەرباقی دەردان. وەڵا هەر سەری خۆم کز گرم و بێدەنگ دانیشم بە حەیای خۆمەوە باشترە دوایی هەر لە ئەحمەدەوە تا دایک و باوک و هەموو خەڵکیش تف و نەعلەتم لێ ئەکەن و ئەبم بە گاڵتەچیی هەموویان. نالێن هەی عەمرت نەمێنێ کەسی ترت نەدۆزییەوە ئەم کوڕە فەقیرە نەبێت.

خونچە بە شپرزەیی و ناڕەحەتی و بێئارامییەوە سەیری سەعاتەکەی ئەکرد و لە دڵی خۆیدا گوتی خوایە ئێستە کە هات چیی پێ بڵێم. ئاخری چاری نەبوو چونکە ئەحمەد هەر ئەبوو بێت بە تایبەتییش کە گوایە لەبەر ئیش و ڕاسپاردەی ئەو هاتووە.

ئەحمەد گەیشتە لایان و دانیشت و چاوەڕێی خونچەی کرد. خونچە خوشکەکانی ڕاسپارد کە کەس نەیەتە سەریان با سەریان لێ تێک نەچێت چونکە ئەحمەد ئەبێ کاغەزەکانی بۆ جیا بکاتەوە.

خونچە کردی بە ژووردا سەعات نزیکی هەشتی ئێوارە بوو دنیاش بەرەو بەهار ئەچوو. باران ئەباری و جار جار لە دوورەوە بروسکە دیار ئەبوو و گرمەی هەوریش ئەهاتە گوێ.

خونچە دەرگای ژوورەکەی پێوە دا و چوو لەسەر کورسییەک دانیشت کە لەگەڵ ئەحمەد سێ کورسییان بەین بوو.

ئەحمەد سەیری کرد نە کاغەزی بە دەستەوەیە و نە زەرف و نە هیچ. ئەوەندەی تر دڵی بێئارام بوو و لە دڵی خۆیدا گوتی خۆیەتی بەخوا پرسەکەم پێ ئەکات و مەسەلە شووکردنە.

خـونچە نەیـدەزانی چـۆن قسـە دامەزرێنێت و لە چییەوە دەسـت پـێ بکات. ئەحمەدیش مات بوو و گوێی هەڵخستبوو و سـەری داخسـتبوو و سـەیری گوڵەکـانی فەرشـی ژوورەکەی ئەکـرد و دڵـی بە قـایمی لـێ ئەدا و لەوە ئەچوو کە ئێستە بۆمبایەک لە بەردەمیدا بتەقێت و مـاوەی نەبێت ڕابکات و پێوە بێت.

ئەحمەد دەستی برد بۆ سەر و لاملـی خـۆی و دوایـی دەسـتی بـرد بـۆ گیرفانی بەرباخەڵی و دەستی خسـتە سـەر گیرفانەکانی تـری. خـونچە وای زانـی بـۆ شـخارتە ئەگەڕێت و گـوتی ئەوە چییـە جگـەرەش فێـر بووی بکێشی؟ ئەحـمەد گـوتی نەوەڵا جگـەرە ناکێشـم هـەر وام ئەزانـی دەفتەرە بچکۆلەکەمم لێ بەجێ ماوە. خونچە زۆری پێ خـۆش بـوو کە ئەم وردە باسـانەیان کـرد و مـاوەی هەناسـە وەرگرتنێکـی دەسـت کەوت.

ئەحـمەد ئـارامی لـێ هەڵگیـرا و لەم پێچوپەنـایە تـاقەتی چـوو و لە دڵـی خۆیدا توورە بوو و ڕووی کـردە خـونچە و گـوتی دەی بـا دەسـت پـێ بکەین بزانم ئیشەکەت چی بوو؟

خـونچە سـەری داخسـت و گـوتی وابـزانم ئەزیەتـم دایـت بەڵام چـارم نەبوو هەر ئەبوو وا بکەم. تەحەملم نەما تاقەتم چوو تا کەی وابم خـۆ دار و بەرد نـیم. خـونچە دەسـتی بـرد بـۆ چـاوی چـونکە فرمێسـک خەریک بوو تێیئەزا و بە قوڕگێکی گیراو گوتی ئەبـێ لێم ببـووری کە ڕەنـگە ناڕەحەتـت کەم. بە ڕاسـتی مـن لە ئینسـانێکی گومبـوو ئەچـم نازانم من کێم و من چیم ئەوێت. خـۆت ئەزانـی ئەوەتەی مـن ئەنـاسـی چۆن ژیاوم و چیم کێشاوە و ئەزانی چەند مەغدوور و تەنیـا بـووم و هەمیشـە وەک دیـل حەپـس وا بـووم. بەڵام ئێسـتە هەر خراپتـر هـەر ناوێرم بجووڵێمەوە لەبەر قسە و قسەڕۆکی خەڵکی. ئەو ئەڵێ وا هـات ئەو ئەڵێ وا چوو، جاری وا هەیە دوو سـێ جـار ئەمـدەن بە شـوو بـێ ئەوەی خـۆم ئاگـام لە هـیچ بێت. ئەحـمەد وەک لە خـوای ئەویسـت کە باسـی خەڵـک و قسـە و قسـەڕۆک هـاتە پێشـەوە. لەبەر ئەوە ئەویـش

خۆی گورج کرد و گوتی ئینجا با خەڵک هەر بۆ خۆیان بڵێن. ئینسان ویژدانی ڕەحەت و ئارام بیت و بەرامبەر بە خوا و خۆی سەر شۆڕ نەبێت و ئیشێکی خراپی نەکردبێت و زەرەری لە کەس نەدابێ و حورمەتی خۆی ڕاگرتبێ، ئیتر بۆچی لە قسەی خەڵک بترسێت؟ ئینجا چاک بکات خراپ بکات هەر نەجاتی نابێت لە دەمی خەڵک. پێغەمبەران و پیاوچاکی دونیا نەیانتوانیوە دڵی هەموو کەس ڕازی کەن و خۆیان لە دەمی خەڵک ڕزگار کەن. ئینجا خەڵکی وەک ئێمەمانان؟ دەبا هەر بڵێن و چی ئەکەن کەیفی خۆیانە وەکو گوتم ئینسان هەر شتێک نەکات کە پێێ سەرشۆڕ بێت ئیتر ئەوەی تر هیچ نییە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەحمەد وا بە گەرمی هاتە پێشەوە و دەستی کرد بەو قسە نەستەق و کتێبییانە، بەڵام لە دڵدا هەر زۆر لەم دانیشت و بانگکردنە ئەترسا و لای وا بوو کە بۆیە ئەم قسانە ئەکات تاکو زەمینە خۆش کات بۆ باسی شووکردنەکەی.

خونچە هەوڵی دا کە بەشکم بتوانێت شتێک بداتە بەرگوێی ئەحمەد بەڵام کەرامەت و حەیا و حورمەتەکەی ڕێیان نە ئەدا و هەروەک دەستیان ئەخستە سەر دەمی و نەهێڵن قسە بکات. خونچە لە دڵی خۆیدا سەرزەنشتی خۆی کرد و گوتی باشە ئەی ئەو هەموو سوێندانە بۆ کوێ چوون؟ بۆ بەرامبەری وا کەڕ و لاڵ بووم خۆ ڕۆژێ لەمەوپێش هەڕەشە و گوڕەشەی دونیام ئەکرد کە چیی پێ بڵێم و چی نەڵێم و چی بکەم ئەی کوا؟ خونچە دیسانەوە گوڕی دایەوە خۆی و دڵی قایم کرد و بە چاوێکی پڕ لە شەرم و تەریقی سەیرێکی ئەحمەدی کرد و گوتی تۆ بۆ ژن ناهێنی؟

ئەحمەد هەستی کرد کە خوێن بە جارێک ورووژمی هێنا بۆ سەر و دەموچاوی و گوتی من؟ من هەر کاتێک تووشی ئەو کەسە بووم کە دڵ پێوەی هەڵواسرا ئەوسا سێ و دووی لێ ناکەم.

خونچە هەر ئەوەندەی نەمابوو کە بڵێت هەی بێئەقڵی بێ هەست و شعور ئەی ئەوە من نیم بەرامبەرت دانیشتووم دە لە دەمت بێتە

دەرەوە و بڵێ ئەی تۆ بۆ نایەیت باوەشت پیا بکەم و بتخەمە دڵمەوە ئیتر ئەمەی بۆ چییە... بەڵام خونچە مات بوو و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی دەسا وەڵا من ئەمەوێت شوو بکەم. ئەحمەد ڕەنگی هەڵبزرکا و خەریک بوو هەڵبچێت و گوتی کەواتە منت لە کەرکووکەوە هێناوە بۆ ئەوەی ئەم پرسەم پێ بکەیت بە خوا شتێکی بەجێیە. ئینجا بە خێری جەنابی ئەم بەختیارە موبارەکە کێیە و چ زاتێکە؟ و هەوندێ مات بوو بەڵام خونچە لەجیاتیی بەدەم ناوی ئەو بەختیارە و ئەو زاتەی پێ بڵێت، وەکو خۆی گوتەنی چاوە شیرینە پڕ خەم و بێئارامییەکەی هەموو شتێکی پێ گوت و فرمێسکە بە کوڵ و دڵەکەی هەموو نهێنییەکی بۆ ئاشکرا کرد.

ئەحمەد حەپەساو و گێژ بوو و چاوی زەق بوو و بڕوای بە چاو و هەستی خۆی نەکرد و ڕووی کردە خونچە و وەکو بزڕکاندن و بە ترسەوە گوتی تۆبڵێی؟ ئەحمەد وەک شێت بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە پەلاماری هەردوو دەستی خونچەی دا کە لەبەر شەرم و تەریقی ئەتگوت تەرزەن و گرتنیە باوەش و کەوتە ماچکردنیان و گوتی ئەوە ڕاست ئەکەیت؟ توخوا ئەمە خەون نییە؟ دیسان وەکو شێت پەلاماری خونچەی دا، سەر، سەرپۆشی، کۆڵوانەی هەمووی ماچ ئەکرد و بە بێدەنگ ئەگریا. خونچەش ئەگریا و زوو زوو سەیری دەرکی ژوورەکەی ئەکرد و وەک پاڕانەوە و بە ئەسپایی ئەیگوت توخوا لەسەرخۆ نەوەکو خوشکەکانم وابزانن ئاخۆ چی قەوماوە. ئەحمەدیش وەکو مەست و سەرخۆش هەڵستایە سەرپێ و هەردوو دەستی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و دەستی ئەخستە سەر سەری و دەستی بە دەموچاوی خۆیدا ئەهێنا و لە ژێر لێوەوە ورتەورتێکی ئەکرد و زوو زوویش چاوی خۆی ئەسڕییەوە. ئەحمەد دانیشتەوە لە نزیک خونچە و پەلاماری دەستی دایەوە و ماچی کردەوە و گوتی ئای لە چ جەهەنەمێکدا ئەژیام. ئای ڕۆژم چەند تاریک و ئارامم لێ هەڵگیرابوو

خەو و خۆشیم نەمابوو هەمووی لەبەر تۆ ئارامی گیان و پەڕەی دڵم و تاقە گوڵم.

خــونچە بە زەردەخەنەیەکــی وەک هیــی مــردوو و بەدەم ئــارەق سڕینەوە گوتی شیعریش ئەزانی؟

ئەحمەد گوتی ئەگەر شیعرم ئەزانی ئێستە بە بەرزایی باڵات شیعرم بۆ گوتبووی و دەسڕەکەم دەرهێنا و گوتی با بڕۆمەوە بە دایکم بڵێم و بە باوکم بڵێم و بە هەموو دونیا بڵێم. ئەحمەد سوور هەڵگەڕابوو جار پێئەکەنی و جار چاوی خۆی ئەسڕییەوە. هەستایەوە سەرپێ و جارێکی تر پەلاماری هەردوو دەستی خونچەی دا و ماچی کردەوە و گوتی با بڕۆم بە هەموو عالەم بڵێم با هەموو کەس بزانێت. ڕووی کردە خونچە و گوتی با ئیتر بڕۆمەوە بەیانی زوو ئەگەمەوە لات ئەگەر مام و لە خۆشییاندا نەمردم. با بڕۆم ئەمشەو تێر بنووم و هەقی هەموو شەوەکانی دڵتەنگی و خەوزڕان بکەمەوە. خواحافیزیی کرد و ڕۆیشت.

ئەحمەد گەیشتە ماڵی خۆیان دایک و برا و خوشکەکانی بە گەرمی چوون بە پیریەوە. ئەحمەد پەلاماری دایکی دا و دەستی کردە ملی و یەک لەسەر یەک بەبێ وچان دەستی کرد بە ماچکردنی. دایکی شڵەژا و حەپەسا و خۆی لە دەست ڕاپسکاند و کێشای بە خۆیدا و گوتی ئەیەڕۆ ئەحمەد ئەوە سەرخۆشی؟ کوڕە ڕۆڵە مەگەر ناڵێم ئەو شەوەی دێیت بۆ لامان خۆت سەرخۆش مەکە لەبەر دڵی باوکت ئێستە دیسان تووڕە ئەبێت. کوڕە ڕۆڵە پێت ئەڵێم لە کەرکووک حەز ئەکەیت شەوی قەڕابەیەک بخۆرەوە بەڵام لێرە بۆ شەوێک دوو شەو وا مەکە. ئەحمەد کەوتە ناو برا و خوشکی ئەمی ماچ ئەکرد و ئەمی ئەدایە بەر زللە و شەقی گاڵتە و گوپی ئەوی تری ئەکێشا. دایکیشی حەپەسابوو و مناڵان پێئەکەنین و هەندێکیشیان ئەترسان و لە دەستی ڕایان ئەکرد.

دایکی ترسا و گوتی ئەیەڕۆ ئەمە چووبووی بۆ کوێ. ئەمە کێ چیی دەرخوارداوی ڕەبی ماڵیان کاول بێت. ئەیەڕۆ خۆ شێتیان کردووە.

کوڕە ڕۆڵە دانیشـە ئـارەقی ڕەش و شـێنت کـردەوە ئێسـتە دوووربـێ دڵت ڕائەوەستێت. ئەحمەد ئەم جارە هـاتەوە بـۆ دایکـی و پەلامـاری دا و گوتی کچێ حەباو گیان کوڕەکەت ژن ئەهێنێ.
دایکی ڕاپەڕیی و پەلاماری دا و گوتی وەی لە دەورت گەڕێم یاخوا، کەی و چۆن؟! دەی زوو پێم بڵێ وا شـێت بـووم لە خۆشـییاندا. کێیە؟ کێیە زوو قسە بکە؟ ئەحمەد باوەشی کردەوە بە ملـی دایکیـدا و بەدەم مـاچەوە وەکـو بڵـێ ئەمە یەک ئەمە دوو. ئینجـا مـاچێکی ئەکـرد و ئەیگوت خونچە خونچە خونچە گوڵەباخ. خونچە گیانی ئەحمەد. دایکی سست بوو و دڵی داخورپا و خۆی لە دەست ڕاپسکاندەوە و سارد بووەوە و بە شپرەزەییەکەوە گوتی کێ؟ چی؟
ئەحمەد هاتەوە سەرخۆ و دانیشت چونکە زۆر هیلاک بووبوو ئەتگوت سەر شاخی قەیوان کەوتبوو کە ئەوەندە ماندوو ئەهاتە بەرچاو.
ئەم جارە لەسەرخۆ گوتی ئەزانی چێ ئەڵێم دایکە گیان، حەباوەخـان کـوڕەکەت کە نـاوی ئەحـمەدە، خونچەخـان ئەهێنێت. چـونکە خۆشـم ئەوێت و خۆشی ئەوێم و هەردووکمان زۆرمان پێ خۆشـە و ڕازیین. تێگەیشـتی؟ نە سەرخۆشـم نە بێهۆشـم بەڵام سەرخۆشـی خـونچەی گوڵەکانم ئیتر ئەمەیە باسی کوڕەکەت و ژنهێنانەکەی و تەواو.
دایکی داما و هەر لە شوێنی خۆی دانیشت و قسەی نەکرد و هەردوو ئەژنـۆی گـرتە بـاوەش و وەکـو ژانـی کردبـێ دەموچـاوی هەڵبزرکـا و وەکو مسیبەتێکی زۆر گەورەی لێ قەومابێت.
ئەحـمەد سـەیرێکی کـرد و بە نـاڕەحەتییەکەوە گـوتی دایـکە گیـان خـۆ ئەوە خەریکـی ئەبـووریێتەوە. ئەحــەد هـاواری خوشـکی کـرد و گـوتی شەوبۆ زوو تۆزێ ئاو بۆ دایکم بێنە و زوو وەرە بەلایەوە و خۆشـی چوو و خەریکی بـوو و گـوتی دایە نـازانم ئەمە لە خۆشـییاندا وات لـێ هـات یـان لەبەر چـی؟ دایکـی چـاوی زەق بووبـوو و تـۆزێ هـاتەوە سـەرخۆ و هەردوو دەسـتی دا بەیەکدا و بە ساردییەکەوە گوتی وەڵا ڕۆڵە دڵم پچڕا نەک خەریک بوو ببووریێمەوە.

ئەحمەد گوتی بۆ لەبەر چی؟
حەبەخانی دایکی دەستی برد بۆ سەری و گوتی ئینجا بۆ ئەوە خەڵک وای لێ نەیەت ئەی بۆچی تر وای لێ بێت؟
ئەحمەد زۆر لەسەر خۆ گوتی پێت نەگوتم بۆ؟
دایکی لەسەر هەمان دانیشتن و هەمان حاڵ و بێ ئەوەی سەیری ئەحمەد بکات گوتی وەڵا ڕۆڵە لەبەر حەیا و ئابڕوومان. بەم قسەیە خەریکی حەیای حەوت باوکمان ئەبەیت، دایکی قسەکەی تەواو کرد و گوتی وەڵا باوکت ئەمەی گوێ لێ بێت یەکسەر خۆی ئەکوژێت. ئەحمەدیش زۆر لەسەرخۆ و بێ ئەوەی خۆی تێک بدات گوتی خوا نەکەردە ئەم ئابڕوو و حەیایەتان بۆ ئەچێت؟ باپیرانیشتان لە قەبرەکانیاندا بۆ سەرشۆڕ ئەبن؟
دایکی گوڕی دایە خۆی و زیندوو بووەوە و دەستی ڕاوەشاند و بە دەنگێکی تووڕەی بەرز گوتی چونکە ئەم قسەیەی کە کردت زۆر قسەیەکی بێمەعنا و زۆر عەیبە. ئەو ژنە چەند ساڵ لەگەڵمانە و مێردی ئەو هەموو ساڵانە وەک خۆشەویستترین برامان بووە. ئەو ژنە دوو عومری تۆی هەیە. خۆ لەبەر دایە ڕەعناش ئەوە هەر ئەبێ خۆمان بشارینەوە. خەڵکیش دوایی حەیامان ئەبەن و ئەڵێ ئەوە خوا ئەزانێت کە چەند لە دەمێکەوە ئەم دوانە حەزیان لە یەک کردبوو و تەماعیشیان کردۆتە موڵک و ماڵێ. ئیتر دەمی خەڵک ئەناسی. بێجگە لە هەمووشی بەقەد دایکتە. ئەیەڕۆ تۆ لە کوێ و ئەو لە کوێ. هەی هاوار خەڵکینە ئەم قسەیە چ بوو کردت!
ئەحمەد گوتی جارێ وەرەوە سەرخۆ و بە شێنەیی بیری لێ بکەرەوە. جارێ بۆ ئەوەی کە ئەڵێی چەند ساڵە تێکەڵێن لەگەڵیان ئەوە قەی چی ئەکات؟ خۆ ئەگەر برایەک بمرێت زۆر جار براکەی تر براژنەکەی مارە ئەکات ئیتر لەبەر هەر هۆیەک بێت. ئەوەی کە ئەڵێیت لەبەر موڵک و ماڵەکەی تەماعم تێکردووە سەری داوە لە بەرد چونکە خۆ منیش پەکم نەکەوتووە و نەمردووم لە برساندا ئەوەتا هەموو

بەخیلیم پێ ئەبەن و بوومە ساحێب مەعاشی چاک و ساحێب ئوتێل و قۆنتەرات لە سایەی خوا و سەری خاڵە مچەوە خوا عەمری درێژ بکات. دوایی ئەو ژنە باشە بە حورمەتە چەند ساڵە تێکەڵمانە و ئاگامان لێ بووە کە چۆن بەبێ دەنگ و بێ ورتە بە دیار ئەو پیاوە نەخۆشەوە بووە خوا عافووی بکات بە خوا بەقەد باوکم خۆشەویست بوو لام. بەڵام چی بکەم ئیتر ئەمری خوایە هەمموومان ئەمرین.
ئێستە ئەم ژنە باشە و لە جوانییشدا کە کچی ٢٥ ساڵەش ڕووی نایەت لە لای دانیشێت و خۆی لەگەڵ بەراورد کات، من خۆشم ئەوێت و ئەویش خۆشی ئەوێم ئیتر من چۆن لەکیس خۆمی ئەدەم و تا ماوم بەو داخەوە ناڵێنم وەڵا چییە لە من گەورەترە. چیی تیایە خۆ کفر نییە با ئەم جارە ژنێک لە مێردەکەی گەورەتر بێت. بۆچی هەر ئەبێ ژنی فەقیر شوو بکات بە پیاوێ بەقەد باوکی و لە باوکیشی گەورەتر. خۆ بە چاوی خۆتان دیتان کە مامە حاجیم خوا عافووی کات دە ساڵ لە باوکی خونچە گەورەتر بوو ئەوە بۆچی بۆ ئەو عەیب نەبوو و شتێکی عادەتی بوو. بەڵام ژنێک ئەڵێی گوڵەباخە چەند ساڵێک لە مێردەکەی گەورەتر بێت ئیتر ئەمە ئەبێ حەیای بچێت و ئابڕووشی نەمێنێت؟
ئەحمەد بە تووڕەبوونەوە پەنجەی هەڵبڕی و گوتی هەرچییەک ئەبێت ببێت و کێ چی ئەڵێت منی نەبێت. من ئەمەوێت ئەم جارە وەزع بگۆڕم و ژنێکی لە خۆم گەورەتر بهێنم و ئەمەش هەر ئەکەم و ئەملا و ئەولای ناوێت. ئەحمەد هەڵچوو و دەستی خستە سەر سەری خۆی و گوتی ئەم سەرەمی لەسەر دائەنێم و هێز نییە بتوانێت بمگێڕێتەوە و پەشیمانم بکاتەوە لەم قسە و نیازە. ئەحمەد هێشتا قسەکەی لە دەمدا بوو تەقەی دەرگا هات و مناڵێک بە ڕاکردن چوو بیکاتەوە، باوکی کردی بە ژووردا و لە بەردەرگا بە ڕوویەکی زۆر خۆشەوە لە کوڕە بچکۆلەکەی پرسیی کە دەرگای کردوە و و گوتی ها کوڕی قۆز چۆنی؟ کاکە ئەحمەدت هاتۆتەوە؟ کوڕەکە بە ماتییەکەوە گوتی بەڵێ

و پێش باوکی کەوت بە پەلە چووە ژوورێکی تر هەر وەک بترسێ لەوەی ئێستە باوکیشی بەم بەزمەی ئەحمەدی برای ئەزانێت و ئاخۆ ببێتە چ شەڕ و فەرتەنەیەک. وەستا قادری باوکی ئەحمەدی برای ئەزانێت و ئاخۆ ببێتە چ شەڕ و فەرتەنەیەک. وەستا قادری باوکی ئەحمەد کردی بە ژووردا و سەلام عەلێکی کرد و ئەحمەد بە زەردەخەنەوە چوو بە پیریەوە، بەڵام پیاوەکە حەپەسا کە دیمەنی ژنەکەی دیت وا خۆی گرمۆڵە کردووە و داماوی و نارەحەتییەکی زۆر لە چارەی ئەبارێت و منداڵیش هەموو بێدەنگ دانیشتوون، هەتا نەریمانی ساحێب بەزم و هەرا و شەقوەشێنی داروبەرد، ئەویش بە کزی و ئاقڵی دانیشتووە و سەیری دەمی ئەوان ئەکات.

وەستا قادر بە پەرۆشییەکەوە گوتی ئەوە بۆ وا ماتن و ڕووی کردە ژنەکەی و گوتی ئەوە چییە دایکی ئەحمەد نەخۆشی؟ چی قەوماوە؟ ژنەکەی دەستێکی برد بۆ سەری و هەندێ جوولایەوە و ئەژنۆی گرتە باوەش و خۆی گرمۆڵە کردەوە هەروەک ژانی کردبێ و هیچی نەگوت. ئەحمەد کە دیی باوکی کەوتە مەراقەوە خەریکە بترسێت ئەویش ویستی مەسەلەکەی پێ بڵێت بەڵام پێش ئەوەی دەم بکاتەوە دیسان خوشکە بچکۆلە دەم بە هاوارەکەی کە ناوی شادانە پێشی کەوت و گوتی بابە کاکە ئەحمەد ژنی هێناوە، ئەحمەد پێکەنی و گوتی هەی شەیتان! چووە پێشەوە لە باوکی، باوکیشی بە پەرۆشەوە سەیری جەماعەتی کرد هەروەک بڵێت بە ڕاستتە؟ بەڵام لە شێوەی دانیشتنی ژنەکە سڵەمییەوە و زانیی کە شتێک ڕووی داوە و بە دڵی ژنەکەی نییە.

ئەحمەد باوکی لە خەیاڵ دا و گوتی ئەرێوەڵا بابە گیان ئەمەوێت ژن بێنم، بەڵام دایکم لەجیاتیی دڵیخۆش بێت کەچی وا خۆی بووراندۆتەوە. باوکی ئەحمەد گوتی ئەوە ڕاست ئەڵێیت؟

ئەحمەد گوتی ئەرێوەڵا بەسەری تۆ. باوکی بە خۆشییەوە ڕاپەڕیی و گوتی یاخوا کوڕم پیرۆزت بێت بە خوا ئیشێکی چاک ئەکەیت و بە

ڕوویەکـی خۆشـەوە ڕووی کـردە حەبـاوی ژنـی و گـوتی ئەوە لە خۆشییاندا وات لێ هـاتووە؟ بزانم هـیچ قسـە نـاکەن کچێ هەسـتن بـا هەڵپەڕین و دیسانەوە ڕووی کردەوە حەباوی ژنی و چووە نزیکی و دەسـتی خسـتە سـەر شـانی و گـوتی ئەوە ئەترسـم لە ئێسـتەوە حەسـوودییت بە بـووکەکەت بێت بۆیە وا عـاجز بـووی. وەسـتا قـادر کردی بە هەرا و بانگی منداڵەکانی کرد دەی هەستن ئەوە بۆ وا مـاتن بۆ وا بێدەنگن، خەریکی پەلی یەک دوانێکیان بـوو کە هەڵیـان بسـێنێت گوایە بیانهێنێتە قسە و پێکەنین.

ژنەکەی لچی هەڵقورتاند و گوتی ماشاءالله ژنی چاک ئەهێنێت! ئەگەر ئەزانی باسی کێ ئەکات بزانە لە من خراپترت بەسـەر نـایەت. بـاوکی ئەحمەد بە بە خۆشییەوە گوتی نەوەڵا وەکو تۆ قەت ناکەم و زۆریـش دڵم خۆش ئەبێت. تەنیا هەر ئەوەیە ناوبانگی خـراپ نەبێت و ڕەوشـت و خـووی عەیبـدار نەبێت ئیتـر هەرچۆنێک بێت مـادام بە دڵـی ئەوە و خۆی پێی خۆشە منیش پێم خۆشە. ئەحـمەد گوتی هەر بـژی بـاوک و پیـاوی ئاقڵ و خوانـاس، وا ئەبێت. دایکـی ئەحـمەد لەم هەمـوو پێچ و پەنا و ئەملا و ئەولایەی زیاتر ڕقی هەستا بۆیە دەستێکی ڕاوەشاند و ڕووی کـردە مێـردەکەی و گـوتی بە قوربـان خەزوور ئاغـا ئەزانـی بووکەکەت کێیە؟

مێردەکەی بە پێکەنین و خۆشییەوە گوتی باشە کێیە؟

حەبەخـان سـەری ڕاوەشـاند و گـوتی خونچەخـان بە قوربـان خونچەخانی حاجی عەلیی خۆمان خوا عەفووی بکات.

وەسـتا ئەحـمەد لە شـوێنی خـۆی دانیشـت و گـوتی چـی چـی ئەڵێیت؟ باش گوێم لێ نەبوو؟

حەبەخـان ئەم جـارە ڕاپەڕیـی و پێـی گـوت و بە جـوانی خسـتیە دەستیەوە. وەستا قادر شڵەژا و دەمی تێکەڵ و پێکەڵ بـوو و سـەیری ژنەکەی کـرد و سـەیری مناڵەکـانی کـرد و سـەیری ئەحـمەدی کـرد و چاوی زەق بوو.

ئەحمەد گوتی چییە بابە گیان بزانم تۆش تێک چوویت خۆ ئێستە گوتت هەر ناوبانگی عەیبدار نەبێت ئیتر موبارەکی بێت بۆ ناوبانگی خونچەخان خراپە؟ باوکی دەستێکی بەسەر و ڕیشیدا هێنا و گوتی استغفرالله، استغفرالله بەڵام چۆن قسەی وا ئەکەیت. بە گاڵتەشەوە نابێ قسەی وا بکەیت.
ئەحمەد گوتی دەسا بەخوا وایە وەکو ئەڵێم و وەکو بە حەباوم گوت سەرمی لەسەر دائەنێم. بەڵام وا جارێ ئەڕۆم ئەنووم و بەیانی قسەیەکی لێ ئەکەین. ئەحمەد شەوباشی لێ کردن و بە توورەبوونێکەوە چووە ژوورەکەی تر کە بنوێت. چووە سەر جێگاکەی دوای ئەوەی جلەکانی گۆڕین و بە دڵێکی خۆش و بە خەیاڵێکی ڕەحەت و ئارام لە دڵی خۆشیدا ئەیگوت خوایە تۆبڵێی ئەمە ڕاست بێ و خەون نەبێت؟ بە خۆشی و پێکەنینەوە لێفەکەی ڕاکێشایە سەر خۆی و چاوی نوقاند. ئەوەند کفت و هیلاک بووبوو ئەوەند ڕووداوی ئەو ئێوارەیە هەڵی تەکاندبوو بۆیە هەر زوو خەوی لێ کەوت و بۆ خۆی نوست. هەرچی نائارامی و شپرزەیی و خەوزڕاندنی شەوانی خۆی هەبوو بۆ دایک و باوکی بەجێ هێشت کە تاکو درەنگە شەو و بگرە تاکو ڕۆژ بووەوە ئەوان هەر دەنگیان ئەهات و هەر مشتومڕیان بوو. جار وەکو شەڕی لێ ئەهات و جار ورتە ورتیان نزم ئەبووەوە. خونچەش ئەو شەوە وەکو ئەحمەد بە دڵێکی خۆش و ئارامەوە بۆخۆی نوست. ئەحمەد بەیانی زوو هەستا. گەشابووەوە لە خۆشییاندا هەموو لەشی پێئەکەنی و بە پەلە خۆی کرد بە حامەمەکەدا و چوو لەبەر ئاوێنەکە ڕاوەستا و دەستی کرد بە ڕیش تاشین جارجاریش لەبەر خۆیەوە ورتەورتێکی لێوە ئەهات ئەوەندەی پێ نەچوو دەستی کرد بە فیکەلێدان و بە فیکە گۆرانیی بۆنی هەڵاڵان دێت سەدای چاو کاڵان دێتی لێ دا و لە یەک دوو جێش دەموچاوی خۆی برینددار کرد ئەویش دیار بوو کە لەبەر فیکەلێدان و گۆرانی گوتن ئاگای لە گوێزانەکە نەمابوو و هەر دەست

بەجێ کەفی سابوونی ڕیش تاشینەکەی بەسەردا ئەهێنا و ئەیگوت دەی هیچ نەبوو زۆر کەمە، هەر باکیشی نەبوو کە چیی لێ دێت.
ئەحمەد لە ڕیشتاشین بووەوە و چوو خۆی گۆڕی و خۆی ڕێکخست و بۆنی عەتری کرد بە خۆیدا. کە ئەشهات و ئەچوو لە ژێرەوە سەیری دایکی ئەکرد. دایک و باوک و ئەوانی تریش ئەتگوت دونیایان بەسەردا ڕووخابوو. عاجز و مات و ڕەنگ هەڵبزرکاو بە تایبەتی کە شەویش باش نەنوستبوون.
حەبە خان بەم کردەوانەی ئەحمەدی کوڕی و خۆی تاس و لووسدانی و فیکەکێشان و گۆرانیگوتنی ئەوەندەی تر سەخڵەت و تووڕە ئەبوو، بەڵام نەیەبردە سەر خۆی و هیچ قسەی نەئەکرد تەنیا یەک دوو جار چووە سەر شەوبۆی کچی و قیڕاندی بەسەریدا کە هەستێت لە خەو مێردەکەشی لێی تووڕە بوو گوتی دە لێیگەڕێ بەسەزمانە با بۆ خۆی بنوێت ئەمڕۆ جومعەیە و مەکتەب نییە چیتە بەسەریەوە.
ئەحمەد ئەیزانی کە ئەوە دایکی داخی دڵی خۆی بەسەر شەوبۆی فەقیردا ئەڕێژێت. لەبەر ئەوە بە زەردەخەنەوە چووە پێشەوە لە دایکی و ڕۆژباشی لێ کرد و گوتی ئەرێ حەبەخان ئەوە بۆ ئەم بەیانییە ئەوەندە تووڕەیت؟ ئەگەر لەبەر چایەکەتە هەر ئێستە ئەچم بۆت لێ ئەنێم خەمت نەبێت. حەبەخانیش بە زەردەخەنەیەکەی تەوساوییەوە سەری بۆ ڕاوەشاند و گوتی نەوەڵا کارت ڕاست بێت. چا لێمەنێ بۆ من چالێنانەکەت هەڵگرە بۆ ئەو جادووگەرەی فێڵی لێ کردووی و خەریکە شێتت ئەکات و حەیامان ئەبات، ئەحمەد هیچ خۆی نەشڵەژاند و خۆی تێک نەدا و گوتی مەترسە ئینشاءالله بۆ ئەویشی لێ ئەنێم. دایکی گوتی خۆ ئەوەتەی هەیت هەر ئاومان کردووە بە دەمتەوە ئەوەکەی زانیوتە ئیش بکەی، بڵێم چی و دەستێکی دا لە سنگی و سەری با دا و گوتی ئای حەباوی نەگبەت خەریکە چۆن ڕەنجبەخەسار ئەبیت، کورت چەند بە نازداری بەخێو

کرد وا ئێستە خەریکە شێت ئەبێت و لەکیست ئەچیت، لچی شۆڕ کرد و بە دەنگێکی نزم دایە پرمەی گریان و گوتی ئەیەڕۆ هەزار کچ دەستت ماچ ئەکەن، وەرە توخوا شوێن ئەم بێوەژنە سحربازە بکەویت!

مێردەکەی هاتە لایەوە و گوتی ئەم گریان و شێوەنەی بۆچییە بەم بەیانییە زووە. جارێ ڕاوەستە و ناوی خوا بێنە ئیش نییە خوا ئاسانی نەکات. منداڵەکان لەسەر دەنگی گریانی دایکیان و گۆڵەی باوکیان یەکە یەکە خەبەریان بووەوە و بە شڵەژاوی و ترسەوە لە خەو ڕاپەڕین منداڵەکەیان یەکسەر ڕای کرد و چوو سەری خستە باوەشی دایکییەوە. شەوبۆ و شەونمی خوشکیشی هەر زوو بە ترسەوە ڕاپەڕین و یەکسەر چوونە چێشتخانەکە. شەوبۆ بە پەلە چووە حەمام دەست و دەموچاوی شت و بە پەلە هاتە دەرێ و گەڕایەوە بۆ چێشتخانەکە و بە شپرزەییەکەوە بە فەقیانەی کراسەکەی دەموچاوی وشک کردەوە و خەریکی ئاگر بوو و خوشکەکەشی بەردەستیی ئەکرد. ئەحمەد بەزەیی بە دایکیدا هاتەوە و چوو لایەوە و دەستی کردە ملی و گوتی باشە من هیچ ناکەم و هیچ ناڵێم، ئەچم بە خاڵە مچە ئەڵێم بزانم ئەو چی دەڵێت.

باوکی وەکو مژدەیەکی زۆر گەورە و خۆشیان دابێتی دەستی دا بەیەکدا و گوتی اشهد باللە ئەمە قسەیەکی بەجێیە و من ڕازیم. ئۆباڵ بە گەردنم ئەم قسەیە زۆر ئاقڵانەیە و زۆر بە ڕوویەکی خۆش و بە گەرمی قسەی کرد و ڕووی کردە ژنەکەی کە هێشتا هەر ئەگریا و گوتی دایکی ئەحمەد ئیتر قسە لەمە باشتر ناگوترێت دە ئیتر دڵی خۆت سەغڵەت مەکە و سەیرکە بزانە کاک مستەفا چی ئەڵێت ئێمەش ڕازیین.

ئەحمەد دانیشت و دایکی چاوی خۆی سڕییەوە و کچەکەی سینیی خستە بەردەمیان و چای بۆ تێکردن ئەوانیش دەستیان کرد بە خواردن.

ئەحمەد زوو زوو سەیرێکی دایکی و باوکی ئەکرد و لە کانگای دڵیدا هەستی بە نارەحەتییەک ئەکرد کەوا لە شەوێوە دایک و باوکی

نارەحەت کردووە. بۆ وا لەپڕ مەسەلەکەی پێ گوتن. ئەبوو وردە وردە تێیانبگەیەنێت و جار بە جار بیداتە بەر گوێیان کەچی وا لەپڕ هاتە سەریان و یەکسەر ئەم قسەیەی پێ گوتن ئەوانیش وەک لە بانێکیان بەردەیتە خوارەوە وا بوو. بۆچی توانیبووی ئەم هەموو ماوەیە ئەم خۆشەویستییە لە دڵی خۆیا و بە هەموو مەراق و ناخۆشی و فرمێسکەوە بشارێتەوە. دەبا شەویش قسەی نەکردایە و پێی نەگوتنایە هەر هیچ نەبێت تاوەکو تەگبیرێکی لەگەڵ خاڵە مچە ئەکرد. بەڵام تازە لە دەست دەرچوو. ئێستە وردە وردە دێنەوە سەرخۆ و باشە بە قسەکەش ڕازین. ئەحمەد بەدەم نان و چا خواردنەوە ئەم بیرانە لە مێشکیدا ئەسووڕانەوە.

ئاخری لە نانخواردن بوونەوە، ئەحمەد هەستایە سەرپێ و گوتی من ئەبێ ئێستە بگەڕێمەوە زۆرم ئیش هەیە و ڕانەوەستا تاوەکو گوێی لە قسەیان بێت و بە پەلە چووە دەرێ لە ژوورەکە و دەست و دەمی خۆی شت و دەستێکی هێنایەوە بەسەر و سنگ و بەرۆکیدا و ڕووی کردە ژوورەکەی لێی ئەنوست، کەلوپەلەکانی بە خێرایی کۆ کردەوە و هەروا بە نارێکی ئاخنیە جانتا بچکۆلەکەیەوە و بانگی نەریمانی برای کرد و جانتا و کلیلی ئوتومبیلەکەی دایە دەست و گوتی بڕۆ ئەم جانتایە بخەرە پشتی ئوتومبیلەکەوە و تۆزێ ئوتومبیلەکەشم بۆ بسڕە بەو پەڕۆیە. ئەحمەد ئاوڕی لە براکەی دایەوە کە خەریک بوو بڕوات و گوتی دیسان وەک جاری پێشوو ئوتومبیلەکە نەخەیتە ئیش ها بیرت نەچێت چیت بەسەر هێنا کە دات لە دیوارەکە.

براکەی گوتی وەڵا کاکە خەتای من نەبوو من ئەمویست بۆت داگیرسێنم چونکە دونیا زۆر سارد بوو گوتم تا دێیتەوە دەرێ لە ماڵ با بۆت حازر بێت. ئەحمەد بە دڵ پێکەنیی و گوتی ڕاست ئەکەیت لە کوێ خەتای تۆ بوو ئوتومبیلەکە لە خۆیەوە ڕۆیشت و خۆیدا بە دیوارەکەدا، براکەشی زەردەخەنە گرتی و جانتاکەی برد و ڕای کردە لای ئوتومبیلەکەوە. ئەحمەد جارێکی تر چووە ژوورەکەی لێی

ئەنوست و هاتەوە دەرێ و چووە لای دایک و باوکی و خواحافیزیی لێ کردن و خوشک و براکانی ماچ کرد و ڕۆیشت، بەڵام دایکی گوێی نەدایە و هەڵناسا هەر لە پاڵەوە وردە وردە بۆی ئەگریا. باوکی لەگەڵی چوو تا بەردەرگای حەوشە. ئەحمەد ئاوڕێکی لە باوکی دایەوە و گوتی با بچم بزانم دایە ڕەعنام نەهاتۆتەوە و خواحافیزییش لە خونچە بکەم. باوکی قسەی نەکرد، بەڵام لە دڵی خۆیدا گوتی دە وا بڵێ. ئەگینا تا شەو درەنگ تۆ لەوێ بووی و دایە ڕەعنات نەهاتبووەوە ئیتر بەم بەیانییە زووە چۆن هاتۆتەوە سەیری ئەم بیانووە بکە.

ئەحمەد زۆری پێ نەچوو لای خونچە و هەر زوو هاتەوە دەرێ. باوکی و منداڵەکانیش لەبەر دەرگا چاوەڕێیان ئەکرد.

نەریمانی برای پەڕۆیەکی گرتبوو بە دەستیەوە گوایە ئۆتومبیلەکە ئەسڕێت و لە پشت سووکانەکەوە دانیشتبوو و خۆی گێڤ کردبوو بە تایبەتی کە ڕێبوارێک بەوێدا تێئەپەڕی تاکو ببینن گوایە وا دانیشتووە و لێئەخوڕێت، بەڵام ئەحمەد زوو گەیشتە سەری و لێی تێک دا.

ئەحمەد جارێکی تر چووە لای دایکی و دەستی کردەوە ملی و هەندێ دڵی دایەوە و ڕۆیشت سواری ئۆتومبیلەکەی بوو.

ئەگەرچی ئەم ناڕەحەتییەی دایک و باوکی هەندێ سەریان لە ئەحمەد شیواند و تووڕەیان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وای هەست ئەکرد کە بارێکی زۆر قورس و کەمەرشکێن لەسەر پشتی نەماوە و هەستی بە گۆڕینێکی زۆر ئەکرد. ئەو ڕێگەوبانەی بە سدانجدا پیا هاتبوو و ڕۆیشتبوو وەکو ڕێگایەکی زۆر تازەی ئەبینی و ئەو دیمەنانەی زۆر جوان و ئەو ڕیگایەی زۆر خۆش ئەهاتە بەرچاوی ئەحمەد بەدەم لێخوڕینەوە جار گۆرانی ئەگوت جاریش خەیاڵی ئەڕۆیشت. بەڵام ئەم جارە بەلای شتی زۆر خۆشدا و لەپڕ دڵ و دەروونی پڕ هیوا و ئومێد ئەبوو و دڵی خۆش ئەبوو بەڵام کە دایک و باوکی بیر ئەکەوتەوە کەوا بە ناڕەحەتی بەجێی هێشت هەندێ مات ئەبوو. بیری

له خاڵە مچە ئەکردەوە ئاخۆ چۆن ئەم خەبەرەی بداتێ. ئەترسێت ئەویش وەک دایک و باوکی بکات ئینجا ئەوسا چی بکات. ئەحمەد بەین بەین هەستی ئەکرد کە زۆر خێرا لێئەخوڕێت بە تایبەتی کە ئۆتومبیل و لۆری بەلادا تێئەپەڕین ئیتر ئەویش خێراییەکەی کەم ئەکردەوە و ڕادیۆکەی ئەکردەوە و هەر هێشتا دوو قسەی نەئەکرد لەپڕ ئەیکوژاندەوە و ئەکەوتەوە فیکەلێدان و گۆرانیگوتن. گەیشتە قەرەهەنجیر دابەزی چایەکی خواردەوە و داوای ماستاوێکی کرد و پارەکەی دا، بەڵام تەنیا قومێکی دا لە ماستاوەکە و بەجێی هێشت و چوو سواربووەوە و کەوتە ڕێ. ئەوەندەی پێ نەچوو گەیشتە بەردەمی ئوتێلەکەیان و دابەزی. خاڵە مچەی پێ گەیشت کە ئەیویست بچێتەوە ماڵی خۆیان. خاڵە لە خۆشیدا بە هەڵەداوان چوو بەپیر ئەحمەدەوە و چاک و چۆنیی گەرمیان لەگەڵ یەک کرد. خاڵە مچە گوتی سەعاتێک لەمەوپێش هاتم گوتم نەوەکو ئیشێکیان پێم بێت، جارێکی تر بە گەرمیەوە گوتی یاخوا بەخێر بێیتەوە بەم شەو و ڕۆژە ئەتگوت دونیام لێ چۆڵ بووە هەر تاقەتم نەمابوو لە دوێنێوە سێ جار هاتووم و هەر گورج گەڕاومەتەوە ماڵێ، یاخوا عەمرت درێژ بێت کوڕم. خاڵە مچە بە شەوقەوە گوتی دەی پێم بڵێ بزانم چی بوو؟ خونچە خان ئیشی چیی پێت بوو؟

ئەحمەد گوتی هیچی وا نەبوو یەک دوو کاغەزی لێ گوم بووبوو بۆم دۆزییەوە. بەڵام هەندێ قسەم هەیە دوایی دائەنیشین و بۆت باس ئەکەم.

خاڵە مچە گوتی دە ئێستە با بچینە ژوورەوە و پێم بڵێ. ئەحمەد گوتی نەوەڵا خاڵە گیان ئێستە هیلاکم. خاڵە پێکەنیی و گوتی منیش برسیمە وەرە بچینەوە ماڵی خۆمان خاڵۆژن دەعوەتی کردووە. ئەحمەد گوتی نەوەڵا خاڵە گیان نۆشی گیانتان بێت هیلاکم ئەمەوێت ئیسراحەت بکەم و بزانم ئیش و کار لە چیدایە. ئەحمەد هاتە هۆڵی ئوتێلەکە و کوڕەکان هاتن بە پیریەوە و چاک و چۆنییان لەگەڵ کرد ئەویش بە

گەرمی هەواڵی پرسین و هەواڵی ئیش و مسافری لێ پرسین کە کێ هاتووە و چەند کەس هاتوون و چەند ڕۆیشتوون.
یەکێ لە کوڕە ئیشکەرەکان هەڵی دایە و گوتی وەڵا کاک ئەحمەد دوای ڕۆیشتنی تۆ بە نیو سەعاتک دیسان کاکە ڕۆستەم و چیشتکەرەکە بوو بە شەڕیان و ئێستە بێ چێشتکەر ماوینەتەوە و گوتی تاوەکو کاک ئەحمەد نەیەتەوە منیش نایەمەوە.
ئەحمەە دەستی دا بەیەکدا و گوتی دیسان؟ ئەم چارە لەسەر چی بوو؟ کاک خدر کە لە هەموویان گورەتر بوو بە تەمەن و بە پلەی ئیشیش و زۆر پیاوێکی کامڵ و بەحورمەت و لەسەرخۆ بوو، جوابی ئەحمەدی دایەوە و گوتی اشهدوبیللا خەتای وەستا بوو ئەگەرچی ڕۆستەم قاپێ چیشتی کرد بەسەریدا بەڵام لە ئەوەڵەوە خەتای وەستا بوو، چونکە فەقیرە کەڕوڵاڵەکە هاتبوو برسیی بوو ڕۆستەمیش گوتی وەستا تۆزێ پەنیر یان ماستی بەرێ وا منیش کولێرەم بۆ هێنا با پێوەی بخوات، وا چاشی بۆ تێئەکەم. کەچی وەستا بوو بە فیشەکە شێتە و گوتی چییە دیسان ئەمە هاتەوە سەرمان. بەم بەیانییە زووە نایەڵێ ئیش بکەین. پەنیری چی برۆ لە بنی مەنجەڵەکە شلەی شەوێ ماوە بیدەرێ. ڕۆستەمیش گوتی گوناحە چۆن بەم بەیانییە زووە ئەوە ئەخورێت. ئیتر ڕۆستەم ئەناسی هەڵچوو و گوتی خۆ نانی باوکت نییە ساحێبەکانی خۆیان گوتوویانە کەی ئەم فەقیرە هات هەرچییەکی ویست بە زیادەوە بیدەنێ و با هەرسێ ژەمە بێت لێرە نان بخوات. وەستاش گوتی تۆ هەقت نییە بەسەر ژووری چێشتخانەوە و خواردنەوە بۆچی من هەقم هەیە بەسەر پەتۆ و سەرین و نوێنی تۆوە. ڕۆستەمیش ڕۆیشت و پەلاماری ئەو چێشتە کۆنەی دا و کردی بەسەری وەستادا.
ئەحمەد بە نارەحەتییەوە گوتی ئیتر ڕۆستەم واز لەم ئیشە قۆڕانەی ناهێنێت ئەگەرچی هەقی بووە بەڵام هەندێ ئیشی زۆر بێجێیە. بەڵام وەستاش ماڵی کاول بێت ڕۆستەم ڕاستی کردووە خۆ ماڵی باوکی

ئەو نەبوو ئەو هەقی چییە قابیلە بە پارووییەکی ئەو پیاوە کەڕولاڵە بەسەزمانە چی بقەومێت. ماڵێ بە قوڕ بگیرێت کە یەکێک شتێک ئەخوا ئەڵێی ڕۆحی دەرئەکێشن ئەوەندەی پێ ناخۆشە. ئەحمەد قسەکەی تەواو کرد و گوتی ئەی خاڵە مچە چیی کرد؟ دیسان کاک خدر هەڵی دایێ و گوتی لێمان شاردۆتەوە و پێمان نەگوتووە و گوتمانە وەستا ژنەکەی نەخۆشە و ئیجازەی وەرگرت تاکو سبەینێ. کوڕێکی تر لە ئیشکەرەکان زەردەخەنە گرتی و خەریک بوو بداتە پڕمەی پێکەنین و گوتی نەمانوێرا بە خاڵە بڵێین لە ترسی ئەوەی شەڕەکە گەورەتر ئەبوو.

ئەحمەد ڕووی زۆر کرابووەوە بەو گوێگرتن و باسی شەڕەش زەردەخەنە لەسەر لێوی نەئەبڕا. هەر پەلەپەلی بوو و نەیەزانی چی ئەوێت گەشابووەوە. کوڕەکانیش فەرقیان بەوە کرد و زانییان کە ئەحمەد شتێکی خۆشی لێ قەوماوە. دایک و باوکی ئەحمەد ئەو ڕۆژە تاکو شەویش هەر بەیەکدا ئەهاتن و ئەمیان شتێکی ئەگوت و ئەوی تر لە داخی دڵی خۆی ئەچوو بە گژیدا و ئەم ئەیگوت و ئەو بۆی ئەسەندەوە.

دایکی ئەحمەد ڕووی ئەکردە مێردەکەی و ئەیگوت ئێستە ئێمە بەوە دڵی خۆمان خۆش ئەکەین کە گوایە خاڵە مچە پێی ئەڵێت نەء کوڕم شتی وا نەکەیت ئەوە چۆن بۆ تۆ ئەبێت! ئەو دوو عومری تۆی هەیە بۆ ناچی کچێکی جوان بۆ خۆت بێنێت! خەیاڵمان خاوە بەخوا ئەویش ڕازی ئەبێت و دڵی عاجز ناکات. مێردەکەی بە گەرمیەوە گوتی ئەوە بە ڕاستتە! دەسا بەخوا ئێستە ئەبینی پەشیمانی ئەکاتەوە و هەر ئەیکات بە کێودا. ئاخر بۆیە من دڵم خۆش بوو کە گوتی ئێستە ئەچم بە خاڵە مچە ئەڵێم و ئەو چی گوت وا ئەکەم، سەری ڕاوەشاند و گوتی چۆن ئەهێڵێ خۆ ناڵێم خوانەکردە شتێکی خراپە استغفرالله وەڵا ئێستەش سەد کچ ئەهێنێ، بەڵام بۆ ئەحمەد نابێت فەرقی عومریان زۆرە ئەگینا هەزار پیاوی ناوداریش منەت ئەبەن هەر ڕازی بێت و

شوویان پێ بکات. حەبەخان لە دڵدا ئەم مەتح و سەنایەی مێردەکەی پێ خۆش نەبوو کە بەم شێوەیە باسی خونچەی ئەکرد، هەروەها خۆشی چونکە تووڕە و دڵی پڕ بوو لەبەر ئەوە بە جارێک هەڵچوو، ڕووی کردە مێردەکەی و لێی ڕاپەڕیی و گوتی دەی دەی هێشتا کەمت مەتح کردووە. سەد کچ ئەهێنێت وادیارە تۆش زۆرت بەدڵە، ئەوە کەی ئەوەندە جوانە. هەر ئەوەیە تۆزێ سپیکەلانەیە و ئەو هەموو جلە جوانە لەبەر ئەکات و ئەو هەموو ئاڵتوونە ئەکات بە خۆیەوە، شەیتانیش وا لەخۆی بکات جوان ئەبێت. مێردەکەی گوتی من مەتحی ناکەم عالەم هەموو مەتحی ئەکەن و کەی جلی جوان خەڵک وا جوان ئەکات. جل و ئاڵتوون قەدوباڵا بەرز ئەکات! یان چاو و برۆ مەست ئەکات! یان سەروپێچ چی لێ ئەکات! خۆ ئێستە جلی جوانی لە بەردا نییە. بە خوشک و دایکم بێت بەڵام بە خوا لە شۆخی و چاکە زیاتری نییە هەر ئەوەیە لەگەڵ ئەحمەد عومریان ناگونجێت.
حەبەخان بە تووڕەبوونەوە شیراندی بەسەر مێردەکەیدا و گوتی کەواتە بۆ بە کوڕەکەت گوت بچێت پرس و پرسیار بکات؟ خۆ خۆت پەلیت ئەگرت و ئەچووی بۆ خوازبێنی، کە ئەوەندە بەدڵتە و لێی ڕازییت؟!
مێردەکەشی ئەیگوت من قسەی ڕاست ئەکەم و خوا ڕاستە و ڕاستی لا خۆشە ئیتر ئەم دوانە هەر بەینێک بێدەنگ ئەبوون و بەزەییان بە منداڵەکانیاندا ئەهاتەوە و بە خۆشیاندا. بەڵام لەپڕ ئەم شتێکی ئەگوت یان ئەوی تر قسەیەکی ئەکرد و جارێکی تر لەپڕ هەڵدەچوونەوە.
باوکی ئەحمەد ئەو ڕۆژە بە هیچ جۆرێک نەچووە دەرەوە، نوێژەکەی هەر لە ماڵەوە ئەکرد و ئەتگوت کەتنێکی زۆر گەورەی کردووە و لەبەر خەڵک خۆی ئەشارێتەوە. زۆر جار کە بە تەنیاش لە ژوورەوە ئەبوو لەبەر خۆیەوە قسەی ئەکرد بێ ئەوەی کەسیش گوێی لێ بگرێت یان کەس لە ژوورەکە هەبێت.
لای ئێوارە خاڵە مچە هاتەوە بۆ لای ئەحمەد و چوون بە جووتە دانیشتن لە ژوورەکەی ئەحمەد. خاڵە مچە سەیرێکی کرد و بە ڕەنگ

و ڕوویدا زانیی کە ئەحمەد دڵخۆشە بۆیە هەر دانیشت و پەلی ئەحمەدی ڕاکێشا و گوتی زوو بڵێ و قسە بکە بزانم ئەوە چیتە؟ ئەحمەد بە تەریقییەکەوە پێکەنیی و گوتی وەڵا نازانم چۆنت پێ بڵێم خاڵە گیان ئەمەوێت ژن بێنم. خاڵە مچە هەردوو دەستی دا بەیەکدا و قاقایەکی خۆشی لێ دا و گوتی دە وا بڵێ بە زاتی خوا ئەمزانی ئەوەت لە دڵدایە دەی زوو پێم بڵێ بووکەکەمان کێیە؟

ئەحمەد سەری داخست و تۆزێ شڵەژا و دەستەپاچە بوو، بەڵام خاڵە ماوەی بیرکردنەوە و خەیاڵڕۆیشتنی نەدایە و گوتی قسە بکە دەی بزانم. ئەحمەد بە ماتییەکەوە گوتی ئەترسم تۆش وەکو دایک و باوکم لێم عاجز بیت. وەڵا ئەوەندە لێیان کردم بە هەرا خەریکم نەوێرم پێت بڵێم. خاڵە مچە بە گوێدانەوەوە گوتی تۆ قسە بکە ئەوەش بزانم شتێک تۆ پێت خۆشت بێت منیش زۆرم پێ خۆشە.

ئەحمەد دەستێکی برد بۆ سەرولامل و دەموچاوی بە ترس و لەرزێکەوە و بە نزمی گوتی وەڵا خاڵە گیان حەز ئەکەم خونچەخان بێنم ئەویش ڕازییە و هەردووکمان پێمان خۆشە. خاڵە ڕاپەڕیی و پەنجەی بەرز کردەوە و گوتی بە قەبری حاجی کاک ئەحمەدی شێخ ئەمزانی ئەم نیازەت ئەوە، خاڵە تۆزێ هاتەوە سەرخۆ و بێدەنگ بوو. ئەحمەدیش هەر بە تەواوی شڵەژا و لە دڵی خۆیدا گوتی ئەوەتا بەخوا ئەمیش پێی ناخۆشە بوو ئێنجا چی بکەم!

خاڵە مچە سەیرێکی ئەحمەدی کرد و گوتی خۆ تۆ ئەزانی عومری چەندە؟ ئەحمەد گوتی بەڵێ ڕەنگە دە ساڵێک لە من گەورەتر بێت. خاڵە مچە سەری ڕاوەشاند و بە گوێدانەوە گوتی هەر ئەوەندەیە. بەڵام تۆ بە دڵ ڕازییت؟ ئەحمەد گوتی نەک هەر ڕازیم منەتیش ئەبەم و دەستیشی ماچ ئەکەم خۆشم ئەوێت و زۆر ئیحترامی ئەگرم. چونکە چەند ساڵە لە نزیکیەوە ژیاوم و ئاگام لێیەتی کە چەند ژنێکی بەحەیا و حورمەتە، ئەحمەد سەری داخست و گوتی جەنابت ئاگات لێ بوو کە ئەم فەقیرە چەند لە مامە عەلیشم خوا عەفوی بکات منالتر

بـوو و چـۆن ئەو هەمـوو سـاڵە بێـدەنگ و ڕازی دانیشـتبوو و کەس جارێک گوێی لە ورتەیەک نەبووبوو، خاڵە گوتی زۆر ڕاستە بەخـوا هیچیشـی پێوە دیـار نییە بێجگە لەوەی کە خەڵک هەر شـەرم ئەکات سەیری بکات و سەری سوورِ ئەمێنێت کە خوا چیی دروست کردووە بە دایک و خوشک و کچم بێت ئەوەنـدە هەڵکەوتـووە و قـۆزە. خـاڵە پێکەنیی و گوتی بەخوا دوژمنیش ٣٠ سـاڵی بـۆ دانانێت. بڵێین ئێستە تۆ عومرت ٣٠ ساڵە و ئەو نزیک چلە، خاڵە هەندێ بێدەنگ بوو وەکو بیر بکاتەوە. دوایی هەر زوو قسـەکەی تەواو کرد و گوتی بە ڕاستی ئـــافرەتێکی هەڵکەوتـــووە و ئەوەی کە منالیشـــی نیـــیە و نەبـــووە بە تەواوی عومر و تەمەنی شاردۆتەوە.

هەردوو لا ماوەیەک بێدەنگ مـانەوە. خـاڵە سـەیرێکی ئەحـەدی کـرد و گوتی ئێستە بە هەموو دڵ ئەڵێیت کەوا قەیناکا و گوێ نـادەیتە فەرقـی عـومر و دوایـی پەشـیمان نـابیتەوە؟ چـونکە کـورِم ئەمە یـاریی منـاڵان نیـیە. ئەمە ناوبانـگ و ئـابڕوو و ژیـانی تـۆ و بە تـایبەتی هیـی ئەو ئافرەتەی لەسەر بەندە. ئەمەوێت چاک چاک بیر بکەیتەوە.

ئەحـمەد لە دڵـی خۆیـدا گـوتی ئـای خـاڵەی فەقیـرە ئەگەر ئەزانـی لە کەیەوە من شـەیدا و شێتی ئەوم و چۆن چەنـد سـاڵە بە سـەدان شـەو لەتـاو ئەو خەوم لـێ زڕاوە و بە ڕۆژیـش هەمـوو هـۆش و هەسـتم لە لای ئەو بووە و نەمزانیوە چی ئەکەم و چی ئەخۆم و چۆن ژیـانم لـێ تاڵ بوو قەت ئەم پرسیارەت لێ نەئەکردم. ئەحمەد سـەری هەڵبڕی و ســەیرێکی خـــاڵە مـــچەی کـــرد و بە چـــاوێکی پـــڕ لە پـــاڕانەوە و بە پەرۆشەوە گوتی خاڵە گیان وا ئەزانم من ئەم قسەیە بە دڵ و بە گیان ئەکەم و ئەمەش قســـەی ئێســـتەم نیـــیە و ئەو ژنە وا جێگـــای خـــۆی کردۆتەوە لە مێشک و دڵ و دەروونمدا مەگەر مەرگ و مـردن بتـوانێ ئەو جێگایەم پێ هەڵکەنن.

خـاڵە مـچە وەکـو پیـاوێکی دونیادیـدەی پـڕ تەجروبـوە تێگەیشـت کە ئەحـمەد چـی ئەڵێـت لەبەر ئەوە پەلامـاری دا گـوتی کەواتە پیـرۆز و

موبارەکت بێت هیوام هەیە لەوپەڕی بەختیاریدا بژین. هیچ دڵ لە دڵ مەدە بەخوا شارێک ئەهێنێت عومر و تەمەن چییە شەرت دیمەن و شۆخی و لێهاتن و توانای ئینسان و ناوبانگ و ڕەوشت و خۆی جوانە. خاڵە لە دڵی خۆیدا بەزەیی بە ئەحمەددا هاتەوە و دەستی دا بە پشتیدا و گوتی گوێ مەدەرە هیچ هەمووی بۆ خاڵی خۆت بەجێ بهێڵە. ئەحمەد هەر ئەوەندەی نەمابوو ببووریێتەوە لە خۆشییاندا بۆیە هەر ئەوەندەی پێ کرا پەلاماری خاڵە مچەی بدات و بڵێ توخوا خاڵە گیان ڕازییت؟ دەستی کردە ملی خاڵە و دەستی کرد بە ماچکردنی دەستی و سەری و قۆڵی و شانی. خاڵە مچە جارێکی تر دەستی دایەوە بە شانی ئەحمەد و گوتی بڕۆ پیرۆزت بێت هەر لایەق بە تۆیە. خاڵە یەکێ لە قاقا خۆشەکانی خۆی لێ دا و گوتی ئەوەتا بە خوا بە عومری حەفتا هەشتا ساڵیمەوە خۆم بە چەند گەنج ناگۆڕمەوە. هیی وات پیشان دەم بە خوا بە باوکی ئەشێم کەچی لە من پیرتر دیارە خۆ بەوە نییە.

ئەحمەد گوتی یاخوا خاڵە گیان هەر وا سیحەتت باش بێت و هەر گەنج ببیتەوە بەخوا هەر ئەو ترسەم لە دڵدا بوو کە تۆش وەک دایک و باوکم ڕازی نەبیت و لێم عاجز بیت. ئەوسا بێدڵێم نە ئەکردی بەڵام هەر ڕۆژێکم بە مردنێک ئەبوو، ئەحمەد قسەکەی تەواو کرد و گوتی نازانم دایک و باوکم چی لێ بکەم؟ قسە و قسەرۆکی خەڵکیش هەر باس مەکە هەر بمانکەن بە سینەما، ئەحمەد سەری ڕاوەشاند و گوتی زۆر خەمی دایک و باوکم ئەخۆم. خاڵە گوتی هیچ خەمت نەبێت هەموویانت بۆ ئەکەم بە ماستی مەییو. ئەوە یەکەم جار بووە گوێیان لەم قسە و بڕیارەی تۆ بێت و چاوەڕێ نەبوون بۆیە وا تێک چوون. ئێستە ئەوانیش ڕادێن و بە خۆشیی تۆ دڵخۆش ئەبن. ئەحمەد ویستی بڵێت ئەی کەی دەست ئەکات بە جێبەجێکردنی ئەم ئیشەی، بەڵام خۆی گرت و ڕووی نەهات کە هیچ بڵێت و چاوی بڕییە دەمی خاڵە مچە کە چی ئەڵێت و کەی ئەچێت بۆ جێبەجێکردنی ئیشەکەی.

هەفتەیەک تێپەڕیی بەسەر گەڕانەوەی ئەحمەددا لە سلێمانییەوە و گفتوگۆی لەگەڵ خاڵە مچەی لەبارەی ژنهێنانیەوە.
ئەحمەد کێچ کەوتە کۆڵێ و ئارامی نەما چونکە خاڵە مچە بە درێژایی ئەو هەفتەیە هیچ جارێک باسی لەگەڵ نەکردەوە و ئەویش شەرمی ئەکرد کە باسەکەی لەگەڵ بکاتەوە و چاوەڕێی خاڵە مچەی ئەکرد کە بەشکم ئەو باسی بکات. زۆر جار ئەحمەد گوڕی ئەدایە خۆی کە بڵێ دەی توخوا خاڵە گیان ئەوە بۆ باسی ناکەیت. بەڵام هەرچەندی ئەکرد ڕووی نەبوو و هەندێ جاریش بە تەواوی تێک ئەچوو و ئەشڵەژا و لە دڵی خۆیدا ئەیگوت بەخوا خاڵە مچە بیری لێ کردووەتەوە و حەز ناکات و پەشیمان بۆتەوە بۆیە باسی ناکات چونکە نایەوێت دڵم ناڕەحەت کات ئێستە چی بکەم؟ جاری واش هەبوو دڵخۆشیی خۆی ئەدایەوە و ئەیگوت نەبابە زۆری پێ خۆش بوو چەند جار گوتی شارێک ئەهێنێت و مەتحی زۆر کرد. ئەحمەد ئەو هەفتەیە دیسان خەوی پچڕ پچڕ بوو و خەوی زڕا و هەراسانی لە دەموچاوی ئەباری. کە خەوەکەی ئەزڕا خەیاڵ ئەیبرد و ئەیهێنا و تووڕە ئەبوو و قسەی بەو کەسانە ئەگوت کە باسی ئەم عومر و مومرە دێننە پێشەوە و بۆچی شتی وا ئەکەن عەیب و عار و حەکایەت و قسەوباسی لەسەر دروست ئەکەن، کە ئەگەر پیاوێک ژنێک لە خۆی گەورەتر بهێنێت. ئەی بۆچی پیاویش هەقی هەبێت ژنێک بێنێت کە زۆر جار بەقەد کچی هەرە بچووکی بێت. ئەمە بۆ و لەبەرچی؟ دەردی ئەڵێ بۆچی؟ بانێکە و دوو هەوا؟ هەروەها بۆچی پیاو کە هەست بە خۆی ئەکات و حەز و مەز ئەزانێت، بۆ ئەو ڕەوایە کە بە ڕاست و چەپ بە چەندەها جۆر کەیف بکات و ڕابوێرێت و حەز لەم بکات و لەو بکات و سەدان چاوبڕێ بکات و شوێنی ئەم و ئەو بکەوێت؟ تاکو بە خێرێ ئەگاتە ئەو کاتەیی ژن ئەهێنێت و ئیتر دامەزرێت و ببێت بە ساحێب ماڵ و و منداڵ لە سەدا نەوەدی پیاو ئەو کاتەش هەر واز لەو بەدخوویی و بەدڕەوشتییان ناهێنن و هیچ بۆیان

نابێت بە عەیب و عار و کەس هیچیان پێ ناڵێت. ژنی بەسەزمانیش هەر لە کچۆڵەیی و کچێنییەوە بچووکترین سەیرکردنێک یان هەتاکو پێکەنینێکی سادە لەگەڵ پیاوێکی غەریب یان ئاسنایەک بۆی ببێت بە عەیب و ناوزڕین و تا ماوە هەموو کەس بە سووکی تەماشای بکەن و ناوی بەرن. بە ڕاستی ئەمە غەدرە. بەڵام بۆ پیاو قەیناکا ڕۆژی یارێک بگرێت و بەربدات.
لەپڕ ئەحمەد ئەیبینی کەوا بووە بە لایەنگیری سەرسەختی ژن و بە هەموو توانایەوە ئەگەر بە دەستی بوایە هەقی لەو هەموو خەڵکە ئەکردەوە، بە جارێک ئەرک و ئازاری ژنی ئەهاتە بەرچاو و فیداکاری و لێبوردنی بەرامبەر بە منداڵەکانی و بەرامبەر بە دایک و باوک و خێزانی و بەرامبەر بە هەموو کەسێک کە هانای بۆ بەرێت و داوای یارمەتیی لێ بکات. دایکی بیرکەوتەوە و گەڕایەوە بۆ وەختی منداڵێ خۆی کە زۆر چاک بەبیری دێت کە دایکی چەندی ئازاری دیوە و چەند شەونخونیی کێشاوە تا گەورەی کردوون و وەختی کە منداڵیشی ئەبوو چەند ئازاری ئەکێشا و چۆن بە دزییەوە هەموو لچ و لێوی خۆی ئەگەست تاکو دەنگی دەرنەیەت چونکە شەرمی ئەکرد. ئەحمەد شتێکی هاتەوە بیر کە تا بەینێکی زۆری منداڵی ئەو دیمەنەی دایکی فرمێسکی لە چاو هەڵدەقولاند و کە بە شەوانیش ئەهاتە بەرچاوی دەستی ئەکرد بە گریان و سەرینەکەی تەڕ ئەکرد لەبەر فرمێسک، ئەویش کە جارێک وەختێ دایکی منداڵی ئەبوو نەیزانی و چووە لای و بینی کە چۆن بەدەم ژان و پێچەوە ئەگەوزێ و ئەتلێتەوە و چۆن ئارەق بەو زستانە ساردە بە لامل و دەموچاویدا ئەهاتە خوارێ و بەو حاڵەش گرتیە باوەش و ماچی کرد و بۆی گریا و دڵی دایەوە و بە پوورەکەی گوت کە بیباتە دەرەوە تا نارەحەت نەبێت.
ئەحمەد قوڕگی پڕ بوو لە گریان و لە دڵی خۆیدا گوتی ئەی پێش منداڵبوونیش چەند ئەزیەتی لەگەڵ ئەکێشاین و چۆن بەو سکە پڕەوە نانی بۆ حازر ئەکردین و سەری ئەستین و جلی ئەشتین و لە

حەمامەکە بەو حاڵە چۆن هەناسەی سوار ئەبوو و دەستی هەمووی وەک ئاوساوی لێ ئەهات لە ناو ئەو ئاو و کەوف و سابوونەدا کە مناڵەکەشی ئەبوو شەونخونی بە دیارەوە ئەکێشا و شەوی چەند جار لە شیرین خەودا ڕائەپەڕی و باوکیشی بۆ خۆی ئەنووست و هەندێ جاریش شەڕێ ئەوەی لەگەڵ ئەکرد کە دەنگی مناڵەکە ناهێڵێت بنوێت و ڕای ئەکردە ژوورێکی تر. خۆ ئەگەر دایکی لەبەر هیلاکی و قرەقرِی منال داخوازییەکانیان و نەخۆشی و ئەرکیان قسەیەکیشی بکردایە، چۆن باوکی ئەچوو بە گژیدا و لەجیاتیی قسەیەک چەندەها قسەی جواب ئەدایەوە و ئەوەندەی تر تووڕە و نارەحەت ئەکرد. نەیدەوت ئاخر کە ئەو ماندووە و هیلاکە با دوو قسە بکات. لەجیاتیی ئەوەی یارمەتیی بدات و ئەرکی سەرشانی سووک کات هیچ نەبێت بە لاواندنەوە و دوو قسەی خۆش، کەچی ئاوا نارەحەتی ئەکرد.

ئەحمەد ئەو چەند شەوە ئەوە حاڵی بوو بە ڕۆژیش تووڕە دیار بوو و چەند جارێکیش لە یەک دوو شاگرد تووڕە بوو و قیڕاندی بەسەریاندا ئەوانیش سەیری یەکتریان ئەکرد و شانایان هەڵەتەکاند و سەریان سوورمابوو. چونکە ئەوەتەی ئەحمەدیان دیبوو و لەو هەموو ماوەیەدا کە پێکەوە بوون ئەمە یەکەم جار بوو گوێیان لە دەنگی ئەحمەد ئەبوو کە بقیڕێنێ بەسەر خەڵکدا.

ڕۆژێ ئەحمەد بە تەواوی بێتاقەت بوو و خۆی ئامادە کرد کە هەر ئەو بەیانییە خاڵە مچە هات باسی مەسەلەکەی لەگەڵ بکات و پێی بڵێت کە کەی ئەم ئیشەی بۆ جێبەجێ ئەکات وەکو قەولی پێ دابوو.

سەعات بوو بە دە خاڵە دیار نەبوو یازدەش تێپەڕی کرد هەر خاڵە دەرنەکەوت. ئەحمەد سەری دونیای لێ هاتەوە یەک چونکە هیچ ڕۆژێک خاڵە لە سەعات نۆ تێپەڕی نەکردووە و بە هەڵەداوان هاتووە بۆ لایان. بۆیە ئەحمەد بە پەلە شاگردێکی بانگ کرد و گوتی کاکە گیان دڵم زۆر کەوتە مەراقەوە ئەمەوێت بە پەلە بگەیتە ماڵی خاڵە و بزانی خوا نەکەردە چی قەوماوە و بۆچی دەرنەکەوت. ئەترسم

نەخـــۆش بێـــت یـــان چـــی. کـــوڕەکە گـــوتی بەســـەرچاو و بە پەلە بەروانکەکەی لە خۆی کردەوە و ڕۆیشت. ئەحمەد قیڕاندی بەدوایفا و گوتی بەند نەبی زوو بێیتەوە لە مەراقدام.
نیـو سـەعاتێکی پـێ چـوو ئەویـش دەرنەکەوت کە مـاڵی خـاڵە مـچە هەمووی دە دەقیقە نەئەبوو بە تایبەتییش کە ئەحـەد پێی گوتبـوو زوو بێیـتەوە. ئەحـمەد بە تەواوی شـڵەژا و کەوتە مەراقەوە و هەر هـات و هەر چوو دەستی هەڵگڵۆفت و هەر کەسەش پرسێکی پێ بکردایە پێی ئەیگوت دوایی دوایی. ئاخری چاری نەما گوتی ئەمەی بۆ چییە با خۆم بچم لەجیاتیی ئەم خەفەت و مەراقە ئێستە لەوێ ئەبووم. بە پەلە کەوتە ڕێ بەرەو ماڵی خاڵە. کە گەیستە بەردەرگا بە شپرزەییەوە لە زەنـگەکەی دا. ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو کچێکـی مناڵکـار دەرگـای لـێ کـــردەوە و ئەحـــمەد کـــردی بە ژووردا و کە چـــاوی بە حەوشـــە و هەیوانەکەیـان کەوت چـاوی زەق بـوو و حەپەسـا. چـونکە هەرچـی سندووق و مەنجەڵێ قەدیمی تەختە و تەنەکە و کووپە ڕۆن و فەردە برنج و شـەکر و چا هەبوو لەو نـاوەدا بـڵاو کرابـوونەوە. خـاڵە مـچە هـــاتە دەرێ لە ژوورەکەی خـــۆی هەڵ کردبـــوو ســـەروجامانەی داگرتبوو تەنیا کڵاوەکەی لە سەردا بوو و قۆڵی هەڵماڵیبوو لە دەنگی زەنـگەکە هـاتە دەرەوە و کە ئەحـمەدی دی یەک قاقـای لـێ دا خـۆی ئاسـایی و گـوتی ئەی هـاوار ڕەنـگە زۆر ترسـابی؟ ئەحـمەد ئـاهێکی هـــاتەوە بەر و بە حەپەســـاوییەوە گـــوتی ئەرێـــوەڵا بە تـــایبەتی کە حەســـەن هـــات و نەگەڕایەوە. لەو کـــاتەدا حەســـەن هـــاتە دەرەوە لە ژوورێکـی پـێش هەیـوان ئەویـش خـۆی هەڵکردبـوو و سـندووقێکی تەختەی هەڵگرتبوو هەر چاوی بە ئەحمەد کەوت سندووقەکەی دانـا و گوتی بەخوا کاک ئەحمەد گیان خەتای من نەبوو مـن ویسـتم هەر ئەو دەقیقەیە بێمەوە خـاڵە مـچە نەیهێشـت. خـاڵە دیسـان پێکەنیی و گـوتی ئۆبـاڵ بە گەردنـم ڕاسـت ئەکـات و گوتیشـی ئێسـتە کـاک ئەحـمەد نـاڕەحەت ئەبێت، بەڵام چارمـان نەبـوو ئەبـوو ئەو شـتە قورسـانەمان

لەگەڵ هەڵگریت چونکە دامابووین ئەتگوت خوا بۆی ناردووین. خاڵە مچە دەستی ئەحمەدی ڕاکێشا و گوتی چاوت لە حاڵمانە؟ ئەحمەد بە سەرسووڕمان و زەردەخەنەوە گوتی بە ڕاست ئەمە چییە؟ خێرە ئینشاءالله؟ ئەحمەد سەیری کرد یەک دوو ژنیش خۆیان هەڵکردووە و گسک و سەتڵ و پەڕۆیان بە دەستەوەیە.

خاڵە مچە ئەحمەدی بردە هەیوانەکە و گوتی وەرە باست بۆ بکەم.

خاڵە گوتی بەیانی خەریک بووم بێم بۆ لاتان هێشتا نەگەیشتبوومە بەردەرگاکە کە بیکەمەوە گوێم لە دەنگی خوشکە خەجیج بوو. ڕام کرد بزانم چییە کە سەیر ئەکەم خوشکە خەجیج لە هەیوانەکە هەر هەڵدەبەزێت و جلەکانی هەڵدەتەکێنیت و ئەزریکێنێت. بە زاتی خوا وام زانی جلەکانی ئاگری گرتووە. زمانی نەبوو قسە بکات خاڵۆژنت و ئەمانەی تر هەر ڕۆحیان چوو. ژنە هەر هەڵدەبەزییەوە و ئیشارەتی ژووری زەخیرەی ئەکرد. ئاخری تووڕە بووم، گوتم چی بوو چی بوو دە قسە بکە. کەچی چی بڵێت باشە؟ ئەحمەد پێکەنیی و بە پەرۆشەوە گوتی ئێ توخوا چیی گوت؟ خاڵە یەک قاقای تری لێ دا و گوتی وەڵا گوتی مشکە مشک و هەردووکیان بە دڵ پێکەنین و کەوت بە گازی پشتدا. خاڵە مچە دەستێکی بە سەروکڵاوەکەیدا هێنا و گوتی ئەرێ بە سەری تۆ زمانی شکابوو. کە هاتەوە سەرخۆ و تۆزێ هۆشی هاتەوە بەر گوتی مشکە. وەڵا وام زانی ئەلکتریک گرتی. دوایی چوومە ژوورێ و هەندێ گەڕام بەڵام مشکی سەگباب خۆ ڕاناوەستێت لەبەردەممدا دیارە ڕای کردبوو و خۆی شاردبووەوە. خاڵە دەستی هەڵبڕی و گوتی بەڵام برا کە سەیر ئەکەم لە سووچێکی ئەولایەوە کۆمەڵێل برنج ڕژاوە هەر چۆن بڵێی وەستایەکی شارەزا کۆمەڵی کردووە و ڕێکی خستووە. یەکەم جار وام زانی فەردەکە دڕاوە و لێی ڕژاوە کەچی سەیر ئەکەم کورە بابە فەردە لە کوێیە، فەردەکە زۆر دوورە لە کۆمەڵە برنجەکەوە. ئیتر کە پرسیم ئەمە چی بێت خاڵۆژنت گوتی ئەمە ئیشی مشکەکەیە و ئەمە ئەوە وا ئەکات.

خاڵە مچە پێکەنیی و گوتی توخوا حەیوانێکی بچووکی وا سیس و پیس وەرە ئەم هەموو خەڵکە شپرزە بکات و وایان بەسەر بێنێت. ئەوە بوو کە حەسەنت نارد لە خوامان ویست تا ژوورەکەیان لەگەڵ چۆڵ بکات و وا باجی خاوەریش نیازی هەیە کونبڕ و پاکی بکاتەوە.
باجی خاوەریش بە بەردەمیاندا تێپەڕیی گسک و کەلوپەلی پێ بوو و لەبەر خۆیەوە ئەیگوت خۆم ئەزانم ئێستە چۆنیان عیلاج ئەکەم. ئەم ئێوارەیە ئەچمە ماڵی عوسمانی برازام و یەکێ لە پشیلەکانیان ئەهێنم و بەخێوی ئەکەم. ئەوان یەک مشکیان نییە لە ترسی پشیلەکە ئەم خانووە لەچاو خانووەکەی ئەواندا قەسرە. خاڵە مچە ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی ئەڵێی چی تۆزێ دانیشین و شتێک بخۆینەوە؟ ئەحمەد گورج گوتی نەوەڵا زۆرمان ئیش هەیە چاوەڕێی دوو سێ تەلەفۆنم برۆین، باشە. ئەحمەد ئاوڕی لە حەوشەکە دایەوە و گوتی با حەسەن هەر لێرە بێت و یارمەتییان بدات. ئەحمەد بۆیە وای گوت لە ترسی خاڵە مچە کە نەوەکو بیگوتایە با جارێ من لێرەبم و نەیەم.
خاڵە گوتی کەواتە با ئێمە بڕۆین و چوو جامانەکەی هەڵگرت و خواحافیزییان لە خاڵۆژن و جەماعەت کرد و ڕۆیشتن بەرەو ئوتێل.
تا گەیشتنە ئوتێلەکە ئەحمەد دوو سێ جار ناوی سلێمانیی برد و لە مسافرەکانەوە هێنای کە ئەوانەی لە ژووری بەردەرگاکە بوون، گەڕانەوە بۆ سلێمانی و ئیشەکەیان تەواو نەبوو و گوتیان دێینەوە بەڵام خاڵە بەسەر قسەکەدا بازی دا و باسی شتێکی تری کرد. ئەحمەد ئارامی نەما و خۆی گورج کرد و بە زەردەخەنەوە گوتی ئەرێ خاڵە گیان کەی ئیشەکەم بۆ جێبەجێ ئەکەیت؟ خاڵە هەنگاوی هەڵهێنا بەسەر پێپلیکەکانی بەردەمی ئوتێلەکە دا و ئەحمەد بە دوایەوە. خاڵە گوتی باشە بەسەرچاو با بچین قسەی لێ بکەین. کەی ئەڵێی حازرم. هەردووکیان چوونە ژوورەوە بۆ ناو ئوتێلەکە و لە دالانەکە چەند کەسێکیان پێ گەیشت ئەوەی ئەهاتە ژوورەوە بە جانتاوە و ئەوەی خۆی حازر کردبوو و چاوەڕێی ئەکرد کە

حسابەکەی بدات و بڕوات ئیتر ئەمانیش سەلامیان لە خەڵکەکە کرد و گەیشتنە هۆڵی ئوتێلەکە کە هەموو ژوورەکانی خوارەوەی بە سەرەوە بوو هەروەها ژووری نانخواردن و چایخانەکەش لەگەڵ پێپلیکەیەک کە ئەچووە چینی خوارەوە. ئەحمەد هەستی کرد کە لە چایخانەکە هەندێ دەنگی قڕە و مشتومڕ دێت خەریک بوو لێک ببێتەوە لە داخاندا، چونکە ئەو خواخوایەتی کە خاڵە مچە بێت لەگەڵی دانیشێت و باسێکی ئیشەکەی کەچی سەیری بەخت بکە تاکو ئەم بەو حاڵە درکاندی خەریکن لە شوێنێک دانیشن قسەی لێ بکەن سەیری قڕە و شەڕ و بەزمی ئەمان کە ئێستە خاڵە مچە خۆی ئەخاتە ناوی و ئەوەندەی تر شەڕەکە گەورەتر ئەکات دەردی ڕۆستەم گوتەنی. چونکە زۆر تووڕە ئەبێت کە ئەم شاگردانە شەڕ لەگەڵ یەک ئەکەن و هەمیشە قسەیان پێ ئەڵێت. ئەحمەد قسەی بەسەردا هێنا و ویستی خاڵە مچە دوور بخاتەوە لەو ناوە و خۆی بە پەلە بچێت و بزانێت کە ئەمە چییە. بەڵام خاڵە خۆی پێشکەوت و گوتی چییە ئەڵێی دیسان ئەم سەرسەرییانە بەربوونەتە گیانی یەک. ئەحمەد وەک پاڕانەوە گوتی گوێ مەدەرێ و خۆی نارەحەت مەکە وا من ئەچم بزانم چییە. وابزانم گاڵتە و پێکەنینە. بەڵام خاڵە یەکسەر چوو بەرەو چایخانەکە بەدەم بۆڵەبۆڵ و جنێودانی ژێر لێوەوە. ئەحمەد دەستی دا بەیەکدا و لە دڵی خۆیدا گوتی کوڕە خوا بەزمم هەر بۆ ئەنێری تا هیی مشک تەواو بوو ئەمە دەستی پێ کرد. دەبڵێ ئەم مشتومڕەیە بۆ لەو وەختەدا بوو کە خاڵە مچە هات و بۆ لە بەیانییەوە وایان نەئەکرد یان لە بەختی من بوو.

ئەحمەد چاری نەما و لەگەڵ خاڵە چوونە ژوورەوە سەیریان کرد کەوا دوو شاگرد پەلاماری یەکیان داوە و وا دەستیان لە یەخەی یەک گیر کردووە و ڕۆستەم لە یەکیان ئەکاتەوە. خاڵە بۆیان چوو و گوتی ئەوە چییە ئەوە چییە؟ دیسان وا بەربوونەتە سەروپۆتەڵاکی یەک

مردووتـان مـرێ ئەڵێـی بـاوکی یەکتریتـان کوشـتووە وا بە دوژمنـانە پەلاماری یەک ئەدەن.
کورەکـان لە یەک جیـا بـوونەوە. سـەروکڵاو و جامـانەی هەریەکەیـان هەڵ درابــووە شــوێنێک بەڵام لە دوورەوە هەر وازیــان نەئەهێنــا و هەڕەشــە و گورەشــەیان لە یەک ئەکـرد. یەکێکیـان گـوتی پیـاو ئەبـم ئەگەر ئیتـر لەو خـانووەدا شـەوی تیا ڕۆژ بکەمەوە. ئەوی تـر جوابی دایەوە و گوتی دەبڕۆ بۆ کوێ ئەچیت بچۆ چاوت دەرئەهـات و ملـت ئەشکا وەڵا وابزانم کە ڕۆیشتی ئیتر نـان و ئاومـان لـێ حەرام ئەبێت.
ئەحمەد توورە بوو و بۆیان چوو و گوتی پێم ناڵێن ئەوە بۆ وا ئەکەن ئیشوکارتان هەمووی لەونـاوە کەوتـووە و مسـافر هەمـوو ئێسـتە دێن بۆ نانخواردن پێم نـاڵێن ئەم بەزمەتـان لە چییە؟ عەیـب نـاکەن بۆچی ئێوە مناڵن! هەموو پیـاون و خـاوەن ژن و منـاڵ وەڵا شـەرم ئەکەم کە ئەقیرێنم بەسەرتاندا.
ئەوەی گــوتی ئەمشــەو لە خــانووەکە نــامێنم و ئەگــوێزمەوە ســوور هەڵگەڕابــوو جامــانە و کــڵاوەکەی بە دەســتەوە گرتبــوو کە تــۆزێ لەوەوپێش لەسەر ئەرزەکە هەڵی گرتبووەوە، کڵاوەکەی کردە سـەری و گوتی بـاوکم کـاک ئەحمەد ژنەکەی ژنەکەمـی شـێت کردووە. ئەوی تر هەڵی دایێ و یەک دوو هەنگـاو بۆی چـووە پێشـەوە و گـوتی وەڵا ماشاءالله ژنەکەی تۆ ئەقڵ و مەعریفەی لێ ئەبارێت و ژنی مـن شـێتە! بەخوا دەسا ژنەکەت هەر فڕی بەسەر دونیاوە نییە.
خـاڵە تـوڕە بـوو و گـوتی ئەڵـم بەسـە و عەیـبە و نـاوی ژن مەهێـنن. ئێستە چی بووە؟ یەکەمەکەیـان گوتی کوڕە بـاوکم خـاڵە گیـان سـلام علـیکم، خـاڵە بە توورەبـوونەوە گـوتی ئـێ باشـە علـیکم السـلام. ئینجـا یەکەمەکەیان کە نـاوی خەسـرەو بـوو گـوتی خـاڵە کـورە بـاوکم وەکـو ئەزانن نزیکی شـەش سـاڵە بە هەردووکمـان خانوویەکمـان گرتـووە بە کـرێ و لەو مـاوەی شـەش سـاڵەدا شـەش سـەعات ڕەحەتـیم نەدیـوە. ئەڕۆمەوە ماڵێ ماندوو و هیلاک بە تایبەتی ئەو ڕۆژانەی لێرە خەفەر

ئەبم ئیتر کە ئێواران ئەچمەوە کاول بووە کە زۆر جار ئەوەندە شەڕ ئەکەم و نارەحەت ئەبم یەکسەر ئەگەڕێمەوە، مالّی چی! بڕوام پێ بکەن کە هەندێ ئێوارە ئەچمەوە ئەبینم هێستا پیالەی بەیانی و قاپی نیوەڕۆ لە حەوشە و لەبەر بەلووعەکە کەلەشێر و مریشک تەراتێنی تیا ئەکات. ئەمە بۆچی؟ وەلا خانمی من و خانمی ئەو هەر لە بەیانییەوە دائەنیشن باسی دەرودراوسێ و خزم و ناسیاو ئەکەن و پێئەکەنن و ئەلێی جاسووسی گەڕەکن. ئەزانن مالّی ئەمدیو چییان لێ ناوە ئەودیو چییان کردووە، مالّەکەی ئەولاتریان کراسی چییان کردووە و کچی مالێ سەرووترمان چەند کەس حەزی لێ کردووە و بەوەش ڕازی نابن یەکێکیان دائەنیشێت بەدیار منالّی هەردوولاوە و ئەوی تر عەبا ئەدا بەسەریدا و ئەچێت بۆ ناو بازاڕ بزانێت قوماشی چی داهاتووە و کێ چیی کڕیوە و سەری مالّی کێ و کێ بدات تەلەگراف بۆ ئەوی تر بێنێت و ئینجا کە هاتیشەوە بە جووتە دائەنیشن قسە ئەکەن و خۆیان ئەخەن بە گازی پشتدا لەبەر پێکەنین و باسی خەلّک ئەکەن و شاخ و کلکیان لێ دەرئەهێنن و خۆشیان لە هەموو کەس خراپترن. ئینجا چێشت و نان لەوێدا ئەکەوێت منالێ فەقیر دێنەوە لە مەکتەب هیچ نییە بیخۆن. ئینجا ئەبێتە شەڕ و هەرا. تاکو ئێستا چەند جار پشیلە گۆشتەکەیانی فڕاندووە کە دای ئەنێن بە خێری و وردی بکەن و بیخەنە سەر ئاگر، ئەوەندە قسە ئەکەن و تەکبیر ئەکەن لەگەڵ یەک و پیلان دائەنێن گۆشتەکەیان یان پشیلە پەلاماری ئەدات و ئەیبات یان لەسەر ئاگرەکە ئەسووتێت. تا ئێستە چەند جار لە ژنەکەی خۆمم داوە و تۆراوە و ڕۆیشتووە، بەلام هێشتا ئەو ڕۆژێک نەیویراوە بە ژنەکەی بلێت ئەوە بۆ وا ئەکەیت ئەوەندە لێی ئەترسێت.

ئەوی تر خۆی دانەواندەوە بۆ کەوشەکەی، بەلام دای نایەوە و گوتی ئاخ خۆزگە خالە مچە و کاک ئەحمەد لێرە نەئەبوون خۆم ئەمزانی چیم لێ ئەکردی. من ئەترسم لە ژنەکەم یان تۆ؟

خاڵە مچە بە تووڕەبوونەوە گوتی بەسە بەس ئیتر بیبڕنەوە حەیاتان بچێت. نە باوکم کەستان ترسنۆک نین و هەردووکتان پاڵەوانن ماشاءالله. عەیب ناکەن شەش ساڵە پێکەوە ئەژین وەکو برا لە ماڵ و خانوویەکدا، ژنەکانتان لە خوشک زیاترن پێکەوە گەورە بوون کەچی قسەی وا قۆڕ بە یەکتر ئەڵێن. زۆر عەیبە بۆتان. ئەحمەد یەکێکیانی بردە دەرێ لەگەڵ خۆی و ناردی بە ئیشێک ئەوی تریش خاڵە ناردیە سەرێ و ئیشێکی پێ ڕاسپارد. ئەحمەدیش خەریک بوو لێک ببێتەوە و بە پەلە گەڕایەوە لای خاڵە مچە نەوەکو لە دەستی دەربچیت یان ڕەفیق و ئاشنایەک بێن و ئیتر کێ لەسەر دۆمینە هەڵی ئەگرێت!

باش بوو فریای خاڵە کەوت و پێکەوە چوون بەرەو ژوورەکەی ئەحمەد کە دانیشتن و قسە بکەن لە حەوشەکە ڕۆستەمیان پێ گەیشت کە ناردبوویان بە ئیشێک. ڕۆستەم ئاوڕی لە خاڵە مچە و ئەحمەد دایەوە و پێکەنیی و گوتی خاڵە ئەمانە هەر چەند مانگێک ئەمە حاڵیانە و شەڕێکی واش ئەکەن، بەڵام درۆش ئەکەن یەک ڕۆژیش ناتوانن قسە لەگەڵ یەک نەکەن. ئەمانە کە شەڕ ئەکەن ژنەکانیان هەر گوێشیان لێ نییە و ڕۆحیان لەسەر سەری یەکە. زۆر سەیرن قەت کەسی وام نەدیوە چونکە خوشکیش لەگەڵ خوشکی شەڕ ئەکات و هەندێ جار بەخیلی و حەسوودییشی پێ ئەبات، بەڵام ئەمانە هەر شتێکی سەیرن. ئەمیان کراس ناکات تاکو ئەوی تریش نەیکات. پارووەکەیان ئەکەن بە دوو کەرتەوە لەگەڵ یەک. مناڵی یەکتر بەخێو ئەکەن. لە هەمووشی سەیرتر هیچی یەکتریش نین هەر ئەوەیە مێردەکانیان پێکەوە لێرە ئیش ئەکەن و چەند ساڵ پێش ئێستەش ئەو خانووەیان پێکەوە گرتووە بە کرێ. ئەحمەد خەریک ئەبوو ئیتر واز بێنێت و بڵێت دیارە خوا ئەم ئیشەی منی پێ ناخۆشە بۆیە وا هەر تەگەرەی تێئەخات و لە ڕقاندا خەریک بوو بڵێت بابە هیچ وازمان هێنا و نەمانویست. خاڵە مچە خۆی پەلی ئەحمەدی ڕاکێشا و گوتی بە

ڕاست ئەمە چ بەیانییەک بوو؟ ئەحمەد پێکەنیی و گوتی سەرباقی هەمووی ئەم حەکایەت گێڕانەوەی ڕۆستەم بوو.
هەرچۆنێک بوو هەموو بەزمەکان تەواو بوون و ئەحمەد هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و چوونە ژوورەکە دانیشتن بە تەنیا.
ئەحمەد دانیشت و دەستی کرد بە گیرفانی و دوو سێ کاغەزی دەرهێنا و سەیرێکی کردن و گورج خستنیە گیرفانی و گوتی خاڵە دەی خاڵە گیان ئیشەکە چی لێ ئەکەیت؟
خاڵە پێکەنیی و دەستی خستە سەرشانی ئەحمەد و گوتی خاڵە ئەرێوەڵا با قسەی لێ بکەین تاکو بزانین چی ئەکەین!
ئەحمەد زەردەخەنەیەک گرتی بێ ئەوەی هێچ بڵێت.
خاڵە گوتی خاڵە بە ئەقڵی تۆ کەی بچم بۆ سلێمانی باشە؟
ئەحمەد بە تەریقییەکەوە گوتی کەیفی جەنابتە.
خاڵە مچە گوتی خاڵە باشە ئەمڕۆ چییە؟
ئەحمەد گوتی خاڵە ئەمڕۆ دووشەممەیە.
خاڵە گوتی ئەڵێی چی بەیانی پێنجشەممە بڕۆم.
ئەحمەد گوتی چۆن پێت خۆشە وا بەڵام حەز ئەکەم تۆزێ زووتر بێت لەبەر دایکم و باوکم. دایکمم زۆر بە ناڕەحەتی بەجێ هێشت.
خاڵە گوتی ڕاست ئەکەیت خۆ زۆر بەند نابن لەبەر ئەوە با زوو بڕۆم و زوو بێمەوە. کەواتە با سبەینێ دوای چاخواردن ناوی خوای لێبێنم و بڕۆم. ئەحمەد دڵی خۆش بوو و گوتی چۆن ئەفەرمووی باشە. دوایی لە دڵی خۆیدا گوتی ئەڵێی چی بە خاڵە بڵێم با خۆم بە ئۆتومبیلەکەم بتبەم بەڵام گورج پەشیمان بووەوە گوتی نەء با لەوێ نەبم کە ئەو بۆمبایە ئەتەقێنێت. دایکم دڵی بەو خۆشە و ئەویش ئێستە ئەچێت و ئەڵێت هاتووم بۆ خوازبێنی.
خاڵە مچە گەیشتە سلێمانی و لە ماڵی خزمەکەی پشوویەکی دا و نانی نیوەڕۆی خوارد و هەستا و کەوتە ڕێ بەرەو ماڵی باوکی ئەحمەد.
خاڵە مچە لە دەرگای دا و چووە ژوورێ و سەلامی کرد و بە

سەرسوورِمانەوە سەیرێکی کردن و هەر ڕاست وا بوون وەکو ئەحمەد بۆی گێرابووەوە و دایکی هەر ئەوەندەی نەمابوو کە جلی ڕەشی لەبەر نەکردبوو ئەگینا ئەتگوت تەعزییەیانە. باوکی ئەحمەد خۆی گرِمۆڵە کردبوو تەسبیحاتی ئەکرد، کز و مەلوول و مات دانیشتبوو.

خاڵە دایە پرمەی پێکەنین و دەستی خۆی هەڵبرِی و کێشای بە ڕانی خۆیدا و گوتی ئەوە چیتانە؟ چیتان لێقەوماوە مردووتان نەمریێ. وەڵا ترسام وەمزانی شتێک قەوماوە.

وەستا قادری باوکی ئەحمەد بەدەم تەسبیحاتەوە و بە کزییەکەوە گوتی وەڵا برام بڵێم چیێ ئینجا لەمە خراپتر ئەبێت چی بیێ!

خاڵە مچە گوتی بۆ چی قەوماوە؟ ئەوە ناشیێ لەبەر ژنهێنانەکەی ئەحمەد واتان لە خۆتان کردبێت! خاڵە بە تەوسەوە پێکەنیی و گوتی هەمووی لەبەر ئەوەی کورِەکە ژن ئەهێنێت و بە دڵی ئەوە. نە عەیبە و نە عار قسەی چی ئەکات چەند ساڵێک گەورەتر بێت خۆیان ڕازین ئیتر ئەم کۆستکەوتنەی بۆ چییە؟ ئافرەتەکە ئەوەندە هەڵکەوتووە شارێک ئەهێنێت نەک فەرقی چەند ساڵ عومر وەڵا سا من هاتووم بۆ خوازبێنی و ڕووی کردە باوکی ئەحمەد و گوتی ئەبیێ تۆش بێیت لەگەڵم خۆشییت بێت و ترشییت بێت.

حەبەخان سەیرێکی مێردکەی کرد و دەستی ڕاوەشاند و گوتی نەمگوت ئێستە کاک مستەفاش ئەچێتە سەر ئەقڵی ئەو.

خاڵە مچە بە پەرۆشەوە سەیری حەبەخانی کرد و گوتی کچیێ دایکم، کچیێ خوشکم تۆ بۆ وات لە خۆت کردووە. کورِەکە دڵی پێوەیەتی و ئەمە چەند ڕۆژە هەر لیێ ئەپرسم و ئەیهێنم و ئەیبەم هەر لە قسەی خۆی نایەتە خواریێ. ژنەکە، خۆت دیوتە و ئەیناسی کە چۆنە و چۆن نییە ئیتر ئەمەی بۆچییە. حەبە خان خەریک بوو بگریەت و بۆڵەبۆڵی دەستی پیێ کرد.

خاڵە مچە گوتی ئەمەی پیێ ناوێت بەخوا لەوانەیە کورِەکە شتێک لە خۆی بکات دوایی چی ئەکەیت؟

حەبەخان گوتی بەخوا ئێستە سەری خۆم هەڵدەگرم و لەم شارە نامێنم. خەڵکی هەر شێتم ئەکەن و ڕووم نییە سەیری کەس بکەم.
خاڵە پێکەنیی و گوتی ئینجا هەستە وەرە بچین بۆ کەرکووک بۆ لای ئەحمەد. ماوەیەک لەوێ بە تاکو خەڵک تاقەتیان ئەچێت لە قسە و ئەوسا وەرەوە. حەبەخان دەستی دا بە سەنگی خۆیدا و گوتی من بچم بۆ لای! حاشا نە کوڕی منە و نە ئەمەوێت بیبینم.
خاڵە مچە زانیی کە ئەمە دڵی پڕە بۆیە وا ئەڵێت، لەبەر ئەوە هەر قسەی وای ئەکرد کە بەشکم خاوی بکاتەوە. ئینجا بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی باشە باوکم دایکی مەبە و بەڵام کە شوێنێکی ئێشا خەفەتی بۆ مەخۆ ئەگەر ڕاست ئەکەیت. حەبەخان سەری با دا و گوتی نە نە نە هەقم نییە بەسەریەوە چیش ئەکات کەیفی خۆیەتی، بە تووڕەبوونێکەوە ڕووی کردە مێردەکەی و گوتی توقەبری باوکت توسەری ئەحمەد چەند جار پێم گوتی کەوا هەندێ شتێ سەیری لێ هەست ئەکەم و بەتەنگەوەبوونی ئەو ژنەی زۆر زیادە و زۆر زۆر ترساوم. تۆش تووڕە ئەبووی و ئەتگوت کوڕەکە بەڕەحمە و وەک کوڕیانە تۆ چەند دڵت پیسە و خەیاڵی چۆن ئەکەیت.
خاڵە مچە پێکەنیی و گوتی خۆ تۆ ئێستە گوتت هەقم نییە بەسەریەوە کەچی سوێند بە سەری ئەخۆی!
خاڵە هەندێ قسەی تری لەگەڵ کردن و تۆزێ دڵی دانەوە و قسەی گاڵتە و پێکەنینی تێکەڵ کرد و هەندێ حەبەخانی هێنایە پێکەنین و تاکو ئێوارە هەر لایان مایەوە. دوایی مناڵێکیانی بانگ کرد و گوتی ئا بڕۆ بابە گیان بزانە خونچە لە ماڵە ئەمەوێت سەرێکی بدەم. ئەوەندەی پێ نەچوو مناڵەکە گەڕایەوە و گوتی خونچەخان ئەڵێت بەخێر بێت.
خاڵە مچە هەستایە سەرپێ و ڕووی کردە باوکی ئەحمەد و گوتی هەستە خەزووری بووکێ وەرە لەگەڵم با بچینە لای بووکەکەت. باوکی ئەحمەد سەری ڕاوەشاند و گوتی من؟ بەخوا ڕووم نییە

سەیری کەس بکەم. دەستی دا بەیەکدا و گوتی لاحول ولا قوة الا باللە. کورە ئۆمەتی محەمەد من ئیتر چۆن ڕووم هەیە سەر هەڵبڕم و سەیری خوشکە ڕەعنا بکەم. تفێکی زۆر قایمی هەڵدا و گوتی یاخوا خەجاڵەت بی کوڕم بۆخۆت و ئیشت کەست نەدۆزیەوە، باوکی ئەحمەد دەنگی نزم کردەوە و لەژێر لێوەوە قسەی کرد کە نەزانرا کە چیی گوت.

خاڵە مچە هەر بە پێوە سەیری ئەکرد. دوایی بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە و بە دەست ئیشارەتی کرد وگوتی تۆ هەر دانیشە دانیشە ماڵت کاول بێت ئەڵێیت دونیات بەسەردا ڕووخاوە ئیتر ناخۆشت کرد، خاڵە بە تووڕەبوونەوە چووە دەرێ و خواحافیزییشی لێ نەکردن.

گەیشتە ماڵی خونچە، ئەویش هات بەپیریەوە و بە گەرمی بەخێرهاتنی کرد. بەڵام هەموو لەشی نیشتبووە سەر ئارەق ئەوەندە شڵەژابوو و تەریق بووبووەوە و لە تاواندا هەر خەریکی سەروسەرپۆشی بوو. خاڵە مچە دانیشت و سەیرێکی خونچەی کرد بەڵام سەیری چیی کرد و چ خونچەیەکی دی و هەروەک ئەوە وا بوو کە ئەمە یەکەم جار بێت خونچە ببینێت و قەت لەمەوپێش ئەمەی بەرامبەری دانیشتبوو نەیدیبێ و یان قەت ئەوەندە سەرنجی نەدابێتێ تاکو بە تەواوی بیبینێت. ڕاستە ئەوساش هەر سەرنجی ڕائەکێشا و ئەیزانی کە ئەمەی بەرامبەری ڕاوەستاوە شتێکی جیاوازە بە تایبەتی لەو کچ و ژن و خەڵکانەی لە دەوروپشت خۆیدا ئەیبینێت و لەگەڵیان تێکەڵە، بەڵام قەت نەیەزانی کە ئەم ژنە یەکجار وا جوان و شۆخە. ئەو سەروپرچە پڕە خورماییەی لە ژێر ئەو سەرپۆشەوە ملی خەڵکی خوار ئەکرد و سەرسامی ئەکرد و وای لێ ئەکرد کە سەر دانەوێنێت بۆ خوا و نەقش و نیگاری کەچی دروست کردووە. چاو، دەم، لێو، ڕوومەت و پێست، دەستوپل، قەدوباڵا. خاڵە مچە لە دڵی خۆیدا گوتی دە وەرە توخوا جنێو مەدە بەو کەسەی حەز ناکات کوڕەکەی ئەمە

بهێنێت. بزانه خەڵک ئاوات ناخوازێت هەر له نزیکی بێت و جار به جار سەیرێکی بکات. سەرەڕای هەمووشی نەجیب و بەئەخلاق. خاڵه هاتەوه سەرخۆی و جارێکی تر چاک و چۆنیی لەگەڵ خونچه کرد و گوتی ئەڵێی کەس له ماڵەوه نییه؟ خونچه گوتی وەڵا ئەمڕۆ نانمان ئەکرد پووریشم لێرەیه لەگەڵ باجی گوڵچین. بەڵام دایه ڕەعنا دوێنێ لەگەڵ کوڕەکەی چوو بۆ هەڵەبجه ئەوانیش لێره بوون چونکه خەزووری کوڕەکەی ئەمری خوای کرد چەند ڕۆژ لەمەوپێش، خونچه هەستا و گوتی چی ئەفەرمووی چایەک شتێک؟ خاڵه گوتی بەخوا هەڵناسیت ئێسته ئەڕۆمەوه ئەوەنده دانانیشم.

خونچه شڵەژا و بێئومێدی شێواندی و دڵی داخورپاند...

- بزانم ئەڵێیت زۆر دانانیشم! کەواته هاتووه پێی بڵێت ئەحمەد نایەوێت بۆیه ئەمه چەند ڕۆژیشه هیچ دەنگی نەبوو. دیاره به هەموویان پێیان گووتووه بۆچی شێت بوویت بۆ ناچی کچێکی منداڵکاری نزیک عومری خۆت بهێنی چیته بەسەر ئەم بێوەژنەوه سەرەڕای دەردیش دوو عومری تۆی هەبێت.

خاڵه مچه به پێکەنین و دەست بەیەکدا دان وەڵا گوتەنی خونچەی له خەیاڵ دا و گوتی ئەحمەد شتێکی پێ گوتووم و ئەگەر وا بێت و هەردووکتان پێتان خۆش بێت زۆر موبارەکه و تۆ هەموو خێر و خۆشییەکت قابیله. هەروەها ئەحمەدیش زۆر کوڕی چاکه و زۆر له عومری خۆی گەورەتر بیر ئەکاتەوه و هیچی تیا نییه، مادام هەردووکتان پێتان خۆشه و ڕازین و هیچ کردەوەیەکی عەیبتان نەکردووه لەبەر ئەوه هیچ گوێ مەدەنێ و ئەگەر لەملا و ئەولاش قسەیەکت بەرگوێ کەوت خۆتی لێ کەڕ بکه. خەڵک خواخوایانه بۆ قسەیەک. لەبەر ئەوه دڵی خۆت ناڕەحەت مەکه. بەخوا شووشت به غەیری ئەحمەدیش بکردایه هەر تاکو بەینێک باسیان ئەکردی. هەروەها ئەحمەد ژنێکی تری بهێنایه هەر بەیت و بالوورەیان بۆ ئەدۆزییەوه.

ئیتر هەندێ کەس بێ قسە و تیر و توانج ئیدارە ناکەن و بۆخۆیان پێی ڕائەبوێرن.
خاڵە مچە ئەم قسانەی کرد چونکە ئەیزانی وەکو کوڕەکە گوتوویەتی کە هەردووکیان ڕازین و زۆریان پێ خۆشە. ئیتر بۆچی تەریقی بکاتەوە و سەرلەنوێ دەست پێ بکات. خاڵە ڕازییت، چی ئەڵێیت؟ بە تایبەتی لە زروفی ئەوا ئەم نەوعە پرسیارانە نیوەمردنێکن. خونچە سەری داخستبوو و هەستی ئەکرد کە وەک لەرزی لێ هاتبێ زۆر هەوڵی دا لەگەڵ خۆی کە بتوانێت پێ لەم شەرم و تەریقییە بنێت و بتوانێت دوو قسە بە ڕێکوپێکی بکات و جوابێکی پیاوەکە بدات یان هیچ نەبێت سوپاسێکی بکات کەوا لەوساوە مەتحی ئەکات و نەسیحەتی ئەکات. کەچی بە جارێک ئەمیش قسەی لە بیر چووەوە و ئەڵێیت کەڕولاڵە و لە منگەمنگ زیاتر هیچی تری پێ ناکرێت. خونچە زۆر ڕقی لە خۆی هەستا و دوو سێ جنێو و دوعای لە خۆی کرد لە دڵی خۆیدا و گوتی هەی عەمرت نەمێنێ ئینشاءالله فێری قسە ئەبیت توخوا فەقیرە زۆر منداڵە نازانێ قسە بکات. هەرچۆنێک بوو خونچە بە سەری داخراوە خۆی گورج کرد و بێ ئەوەی ڕووی بێت سەیری خاڵە بکات گوتی زۆر سوپاست ئەکەم ئەم قسانەت هەمووی لە پیاوەتیی خۆتە و وابزانم ئەم ئیشە تا ڕادەیەک ئەحمەدی تووشی قڕە و ناڕەحەتی ئەکات. بەڵام بە دەست هەردووکمان نییە دیارە خوا وای ڕەزا لەسەرە، خونچە بێدەنگ بوو و قسەکەی تەواو نەکرد. خاڵە هەستی کرد کەوا ئەگریەت و وا فرمێسک وەک باران دێتە خوارەوە بە ڕوومەتەکانیدا.
خاڵە ناڕەحەت بوو و بەزەیی پیا هاتەوە و زانیی کە ئێستە چۆن بیر ئەکاتەوە و ئێستە لە چ حاڵێکدایە. لەبەر ئەوە بە پەرۆشەوە گوتی بۆچی ئەگری خوشک و دایکم خۆ هیچ گوناهێکت نەکردووە. هیچ سەغڵەت مەبە ئەحمەد و باپیری ئەحمەدیش منەت ئەبەن.
خاڵە هەستایە سەرپێ و گوتی بۆچی تۆ کەمی؟ تۆ لە ئەمڕۆوە کچی خۆشەویستی خۆمی و هەر کەسێک یەک تۆز ناڕەحەتت بکات خۆم

ئەزانم چیی پێ ئەکەم. تۆ هەمیشە بەقەدر و بەحورمەت بوویت لە لام، خاڵە پێکەنیی و گوتی چ جای ئێستە ببیت بە ژنی ئەحمەد. ڕەنگە نەزانی ئەحمەد چییە بۆ من، تۆزێ ڕاوەستا و دوایی بە قورگێکی گیراوەوە قسەکەی تەواو کرد و گوتی هەموو دونیا و کوڕ و کچی من ئەحمەدە.

خاڵە هاتەوە سەرخۆ و گوتی وا ئیتر ئەڕۆم سبەینێ بەیانی ئەچمە لای باوک و دایکت و قسە لەگەڵ ئەوانیش ئەکەم و ئیتر ناوی خوای لێ دێنین و بە زووترین کات ئینشاءالله هەموو ئیشەکانمان تەواو ئەکەین و یەکسەر ئەڕۆین بۆ کەرکووک. خونچە هەرچەند کردی نەیتوانی جوابی خاڵە بداتەوە، چونکە خۆشی و گریان و تەریقی زمانیان بەستبوو.

خاڵە مچە گەڕایەوە ماڵی خزمەکەی خۆی. هەرچەندە لە دڵی خۆیدا قەولی کردبوو کە بە هیچ جۆرێک باسی ئەم ئیشە نەکات تاکو دایک و باوکی خونچە نەبینێت. بەڵام خاڵە دیارە خۆی پێ نەگیرابوو و بەدەم قسە و حەکایەت گێڕانەوەوە هەر ئەوەندەی بە خۆی زانی کە تێهەڵچووە و باسی ئەحمەد و خونچە ئەکات و کەوا هەموو شتێک بڕایەوە و بۆ ئەم ئیشە هاتووە و ئەحمەدی چەند خۆش ئەوێت و هەر بە شان و باڵیدا هەڵئەدا و چەند ساڵیکیشی خستە سەر عومری و باسی مووی سپیی کرد کە چۆن کەوتۆتە سەریەوە. خاڵە گەرم بووبوو و خەڵکەکەش گوێیان لێ ئەگرت بە سەرسووڕمانەوە و وەکو لە بانێکیان بەردەیتە خوارەوە وابوو لایان. هەر سەیری دەمی خاڵەیان ئەکرد و گوێیان ئەگرت. یەک دوو ئاشنای هاوعومریشی هاتبوون بۆ لای. ئەوانیش لەگەڵ خزمەکەی دانیشتبوون. جار بە جاریش جەماعەت سەیری یەکتریان ئەکرد بە زەردەخەنەوە. ئاخری یەکێ لە ئاشناکانی خاڵە دەستێکی بە سەر و ڕیشی خۆیدا هێنا و جگەرەیەکی لە پاکەتەکەی دەرهێنا و خستیە بەینی لێویەوە و دەستی برد بۆ شخارتەکە و گوتی وەڵا ئەم قسەیە زۆر سەیرە توخوا ئەوە

به ڕاستته؟ یان گاڵته ئەکەیت و جگەرەکەی داگیرسان. خاڵە سەیری کرد و گوتی وەڵا بە سەری تۆ ڕاستە خۆ یەکی نیسان نییە تا درۆتان لەگەڵ بکەم.
خاوەن ماڵەکە کە خزمی خاڵە بوو هەڵێ دایە و گوتی کوڕە باوکم فەرقی عومریان زۆرە خوا هەڵناگرێت کوڕەکە منداڵە ئەوە بۆ وا عومری زیاد ئەکەیت. وەکو ڕۆژی ڕووناک لەبەرچاومە و ئەزانم شەش مانگ حەسەنی کوڕم لەو گەورەترە و ڕووی کردە ژوورەکە و بانگی کرد ئەرێ بەهیە ئا توخوا وەرە.
بەهـــیەی ژنـــی لە پـــاش نەختـــێ هـــاتە ژوورێ دوای ئەوەی سەرپۆشـــەکەی بە جـوانی بەســـەریدا و سەرودەســـماڵ و ســـنگ و بەرۆکی دەستێکی پیا هێنابوو. بەهیە بە شەرمێکی دەستکرد و نازەوە کە گوایە لە پیاوەکان شەرم ئەکات ڕاوەستا و لکی سەرپۆشەکەی نا بە دەمیەوە و گوتی بەڵێ خێرە؟ مێردەکەی وەکو لەسەر شاهێدی مەسەلەیەکی زۆر گرنگ کە وا چەرخی سووڕانەوەی ئەرز و شەو و ڕۆژی لەسەر بەند بووبێت، ئەوەندە بە پەرۆشەوە ڕاپەڕیی و دەستی ڕاوەشاند و گوتی تو قەبری باوکت، حەسەن گیان و ئەحەی وەستا قادر عومریان چۆنە و فەرقیان چەندە؟ ژنەکەش تۆزێ ڕاوەستا و بە ناز و خومارەوە سەیرێکی سەقفی ژوورەکەی کرد و گوتی حەسەنی من و ئەحەی حەبەخان منالّی سالێکن حەسەنی من گاگۆلکێی ئەکرد کە حەبەخان ئەحمەدی بوو. ئەوسا نزیک یەک و دراوسێ بووین.
مێردەکەی هەڵی دایە و گوتی ڕەحمەت لە دایک و باوکت، لە خانووە بچکۆلەکەی باپیرمان بووین!
مێردەکەی ڕووی کردە جەماعەت و سەرکەوتوانە گوتی باوکم زۆر چاکم لە بیرە لە خۆڕایی وا ناڵێم.
ئاشناکەی تری خاڵە کە تاکو ئەوسا هەر بێدەنگ بوو و گوێی ئەگرت ئەویش هاتە قسە و گوتی وەڵا خۆ ئافرەتەکە زۆر لێوەشاوەیە، بەڵام بڵێم چێ بۆ کوڕەکە زۆر غەدرە چونکە بە تەواوی دوو عومری ئەوی

هەیە. خاڵە دیسان لەسەری کردەوە و هەر ئەیویست ئیشەکە وای لێ بێت کە هیچ نەبێت هەندێکیان بڵێن باشە و قەی چی ئەکات یان تۆزێ خاوی بکەنەوە. بەڵام ئەوان هەروەکو ئیشێکی زۆر نابەجێ و ناڕەوا باسیان ئەکرد. بەهێخانیش بە هەڵەداوان چووە لای منداڵەکانی و خوشکی کە هاتبوو بە میوانی بۆ لای لەگەڵ یەک دوو ژنی تری خزمیان و هەر لە دوورەوە دەستی هەڵبڕی و بە زەردەخەنەیەکی مەکراوییەوە گوتی کچینە ڕاکەن بزانن چی قەوماوە ئەوانیش بە دەی توخوا و هەر کەسە لە کونێکەوە هاتە دەرێ تاکو کچە گەورەکەش کە خەریکی سەعی بوو و سبەینێ ئیمتیحانی هەبوو کتێبەکەی فڕێ دا و ڕای کردە لای دایکی کە بزانێت چی قەوماوە.
دایکی کەوتە گێرانەوەی باسەکەی ئەحمەد و خونچە بە دەم دەست بە سنگ کێشان و ئەیەڕۆ و پەنا بەخوا و توخوا شتی واتان قەت بیستوە. گوێگرەکانیش بە پەرۆشەوە گوێیان لێ ئەگرت و دوایی هەموویان پێکەوە دەستیان کرد بە پێکەنن و هەردوو خوشک کەوتنە باسی نوشتە و سیحر و جادوو کە چۆن ئەو خونچە جادووگەرە ئەحمەدی تەفرە داوە. خاڵە و پیاوەکانیش لە ژوورەوە هەر قڕەیان ئەهات و ئاخری خاڵە چاری نەما و لە دڵی خۆی بووراندەوە ئاشنای یەکەم جاری ئەهات کە ئەو لە سەرەتاوە سەری سوورما و خۆی بووراندەوە لەتاو فەرقی عومر و باسی گوناه و غەدری کرد. هەرچەند خاڵە ویستی قسەی نەداتە ڕوو و هەندێ خۆی بگرێت، بەڵام دوایی چاری نەما کە ئەویش پەلاماری بدات و هێرشی بەرێتە سەر لە دوای ئەوەی بێتامی کرد و ئەوەندە باسی کفر و گوناهی کرد و گاڵتەی پێ کرد لەبەر ئەوە خاڵە بە زەردەخەنەیەکی تەوساوییەوە ڕووی تێکرد و گوتی ئەرێ کاک حەمە ساڵح ئەوە بانێکە و دوو هەوا، برام ئەوە بۆ گوناه نییە بۆ هەندێ کەس کە ژنی سێهەمی لە کچەکەی منداڵتر بێت و ئەوە بۆ بۆ ژنێک ئەوەندە کفر و حەیاچوون بێت کە ئەگەر ئەویش شوو بکات بە یەکێک کە هەندێ لە خۆی منداڵتر

بێت. کابرا سست بوو و گوتی ئینجا کاکه مچه بۆ پیاو جائیزه و شەرع وای فەرمووە.
خاڵه دوو سێ قسەی له ژێر لێوەوە کرد و دوایی ڕووی کردە جەماعەت و گوتی شەرع وای نەفەرمووە کاکه. شەرع ئەڵێت ئەگەر ژنەکەت عەیبێکی هەبێت وەکو نەتوانێت منالی ببێت و بە واجبی ژن و مێردی هەستێت، یان نەخۆشییەکی خراپی هەبێت که چاکبوونەوەی نەبێت. شەرع ئەفەرمویت که ئەوسا ئەتوانی ژنێکی تر بهێنێ بەڵام ئەوەی تریش باش خزمەت بکەیت و یاخود بەبێ دڵ ئازاردان هەرچی هەقی هەیه بیدەیتەوه و تەڵاقی بدەیت. بەڵام شەرع ناڵێ ژن بێنی و ببیته خاوەنی کۆشێ منال و هەرچی ئەرک و ئازاری ماڵ و منالت هەڵگرێت و ئەوەنده بچەوسێتەوە و شەونخونی بکێشیت و نرخی ئەوه هەمووی لەسەر حسابی سیحەت و جوانیی ئەو بێت. دوایی مێرده ئاغاکەی ڕووی لێ وەرگێڕێت و بیری خۆی بەرێتەوە که ئەویش وەختی خۆی کچۆڵەیەکی جوان و قەد باریک و ڕێکوپێک بووە و ئەویش سەد منەتی بردووە تاکو ئەم ژنەیان داوەتێ و دەستی کەوتووە، ئەو ژنەی ئێسته که ڕووی تێناکات و هەوڵی یەکێکی تر ئەدات تاکو ئەویش وەکو ئەم لێ بکات و هەر بەردەوام بێت تاکو ئەیگەیەنێته سێ و چواریش.
کابرا هەر خەریکی جگەرەکەی بوو و هەر ئەیکوژاندەوه و پەنجەی پیا ئەهێنا له ناو تەپڵەکەکەدا و لەوه ئەچوو که ئەیویست بەوه تەریقییەکەی پێ بشارێتەوه. ئاخری جوابی خاڵەی دایەوه و به ماتییەوه گوتی ئەوه ئەزانم چی ئەڵێیت، ئەوه مەقسەدت منه. چونکه من سێ ژنم هێناوه. بەڵام کاکی خۆم ئێوه ئاگادر بوون من ژنی یەکەمم هێشتا گەنج و منال بووم که بۆیان هێنابووم. چەند ساڵ لەگەڵی بووم بەڵام منالی نەئەبوو، خۆ بەبێ منال دانانیشم! ئینجا چووم دایکی عەبەم هێنا. خاڵه قسەکەی له دەم وەرگرتەوه و گوتی باشه ئەزانین که منالی نەئەبوو و ژنی ترت بەسەردا هێنا، ئەوه

قەیناکا. ئەی بۆچی دوای ئەوەی شەش حەوت منالّی بۆ بەخێو کردی، وەکـو دایەن و کارەکەریـان بـوو تـاکو منالّەکانتـان گەورە بـوون و پێگەیشـتن و لە خەم ڕەخسـین کەچـی بەو پیـری و داماوییەوە کـردتە کۆلانـان و هەر ڕۆژە لە مـالّی بـرا و بـرازایەکە. کە ئێسـتە هەق بـوو دوای ئەو هەمـوو ڕەنـج و هیلاکـی و ئەزیەتە بـۆ خـۆی لە شـوێنێک پشووی بدایە و بە دلّنیایی بژیایە. خالّە دەستی بە توندی هەلّبڕی و ڕووی تێکرد و گوتی باشە بۆ وات لیٚ کرد؟ کابرا ڕەنگی هەلّبزرکا و دەنگی بەرز بووەوە و جگەرەیەکی تریشی داگیرساند و گوتی کورە برام تۆ ئاگات لە چییە تەبیعەت خراپ بووبوو لەگەلّ دایکی عەبە و منالّەکـان هەلّـی نەئەکـرد. هەمیشــە دەمەقالّێیـان بـوو و هەر بەوەدا ئەگەیشت بە کچەکان بلّێت وا مەکەن و وا بکەن و وا مەڕۆن و ئەوە لەبەر مەکەن و تاکو ئێستە لە کویٚ بوون. خالّە لە دلّی خۆیدا گوتی ئاخر کچەکان ماشاءالله کەم جرپن و کەم کۆلانکوت بوون.

خـالّە پێکەنیـی و جـوابی کـابرای دایەوە و گـوتی نەوەلا بلّـیٚ ئیتـر پیـر بوو و منالّەکانتان گەورە بوون و ئیتر ئیشتان پیٚ نەمـا، بۆیە کردتـانە کۆلان. سـاحێب مـالّەکە ترسـا نەوەکو بیکەن بە شـەڕی تەواو و ئەمە خەریکە لە لۆمە و تانە دەرچێت. بۆیە بە زەردەخەنەوە گوتی کـورە بـاوکم سـلاواتی لـیٚ بـدەن ئەوە بـۆ کـای کـۆن بە بـا ئەکەن ئەوەی بۆچییە.

خالّە مچە گوتی ئاخر قسەی هەق ڕەقە خەلّک کە مالّەکە شووشە بوو نابێت بەرد بگـرێتە پەنـجەرەی خەلّکـی. جـارێکی تـر خـالّە پێکەنیـی و ڕووی کـردە ئاشــناکەی کە دەمەقالّێیــانە و گــوتی وا وەکــو گوتــت ئایشــەخان بەو ئـاخری عـومرەوە ئـاژاوەی ئەنـایەوە و لە دوای ئەو هەمـوو سـالّە تەلاقـت دا و ڕۆیشـت، ئەی بـۆچی ژنـت بەسـەر دایکـی عەبەدا هێنـا؟! کـابرا منگەمگنـی کـرد و تـۆزیٚ ڕاوەسـتا و قسـەی بـۆ نەهــات. خــالّە یەک قاقــای لــیٚ دا و گــوتی توخــوا چەنـد لە کــافیە گەورەتـری؟ جەمـاعەتیش سـەیری یەکتریـان کـرد و دیـار بـوو کە

دەرەقەی دەمی خاڵە مچە نەئەهاتن و لە کابراش ئەسڵەمنەوە. بۆیە کە هەر کامێک لە مشتومڕکەرەکان ڕووی بکردایە ئەوانی تر لە وەختی قسەکردندا ئەوان بە منگە منگ دەیانوت خاڵە ڕاست ئەکەیت، وا بوو، بەڵێ ڕاستیان پێ ئەگوتن لەگەڵ سەرلەقاندن و زەردەخەنەی دەستکرد. چونکە هەموویان زۆر ئاشنا و هاوڕێی قەدیمی یەکتر و تێکەڵ بوون لەگەڵ یەک و ئەیانویست دڵی هەردووکیان ڕازی بکەن.

بەیانی تاکو خاڵە مچە خۆی کۆ کردەوە کە بچێت بۆ ماڵی دایک و باوکی خونچە هەر بەو بەیانییە نیوەی گەڕەکی مەڵکەندی زانیبوویان و تاکو خاڵە کەوتە ڕێ بەرەو پیرمەسوور کە ماڵی باوکی خونچە لەوێ بوو. چەند کەسێکی پێ گەیشت و لێیان پرسی کە ڕاستە ئەو بۆ ئەو ئیشە هاتووە؟ ئەویش بە زوویی جوابێکی ئەدانەوە و بە پەلە ئەکەوتە ڕێ و ڕانەئەوەستا تاکو قسەکە درێژە بکێشێت. لە ڕێگا خاڵە بیری کردەوە و سەری خۆی با دا و لە ژێر لێوەوە گوتی وەڵا وەستا قادر ڕاستی کرد خۆ خەڵک خەریکن هەر بە خواردن ئەمخۆم. ئەمە لە شەوەوە من خەریکی ئەم بەزمەم و هەر بەوەدا ئەگەم ئەم و ئەو دەمکوت بکەم. ئەوە بۆ ئەم عالەمە ئەوەندە حەز لە قسە و قسەرۆک ئەکەن. دە بڵێ ئاخر ئەم ئافرەتە شوو بکات یان نەیکات چ زەرەرێکی لە ئێوە داوە! شوو بە گەورەتر بکات یان بچووکتر لە خۆی ئەوان ڕازین ئێوە هەقتان چییە بەسەرەوە و ئەم چەنەبازی و هەڵەوەڕییەی ئێوەی بۆ چییە و ئێوە وا مەکەن.

خاڵە بەدەم ئەم بیرانەوە ئەوەندەی نەمابوو بگاتە ماڵی باوکی خونچە و لە دڵی خۆیدا گوتی بۆم ڕاوەستن شەرتبێ بەسەرتانەوە نەچێت خۆم ئەزانم چی بەو کەسە بکەم کە خۆی بکا بە شێخی سەنعان لێمان و ئیش و کاری خەڵک بکا بە عەیب و عار. گەیشتە بەر دەرگاکە و هەندێ ڕاوستا تاکو هاتەوە سەرخۆی و لە دەرگاکەی دا. دەرگا کرایەوە و کردی بە ژووردا و سلام علیکی کرد. باوکی خونچە بە گەرمی چاک و چۆنیی لەگەڵ کرد. دیار بوو کە چاوەڕێی ئەکرد.

دوای هەواڵپرسین خاڵە داخوازییەکەی لە باوکی خونچە کرد. باوکی خونچەش هەندێ خۆی شڵەژاند و خۆی نارەحەت کرد و بیانووشی دیسان فەرقی عومر و قسەی خەڵک بوو ئەگینا شانازیی بە ئەحمەدەوە ئەکات.

خاڵە مچە زۆر لەسەرخۆ گوتی هەردووکیان ئەم فەرقی عومرە ئەزانن. بۆ قسەی خەڵکیش ئەڵێن هیچ ئێشێکی بێشەرعییان نەکردووە و ئەوەی باسمان ئەکات با تێر ئاوی سارد بخواتەوە.

خاڵە بە دەنگێکی هەندێ نزم گوتی وابزانم خونچە خان ئەتوانێت و هەقی هەیە کە چۆن ئەیەوێت وا شوو بکات و پرسیش بە کەس نەکات چونکە گەورەیە و هەقی نەفسی خۆی هەیە بەڵام ئەو لەگەڵ ئەوەشدا هەر دڵی ئێوەی ئەوێت و ئەیەوێت هیچ شتێک بەبێ ڕەزامەندیی ئێوە نەکات. لەبەر ئەوە وابزانم ئێوەش بڵێن موبارەکی بێت زۆر باشترە لەم قسانە.

خاڵە مچە تۆزێکی تریش دانیشت و دایکی خونچەشیان بانگ کرد. بەڵام ئەو ئەمەی لە لا شتێکی سەیر و عەجایب نەبوو و ڕوی کردە مێردەکەی و گوتی ئەم ئاخ و ئۆفەی بۆچییە مادام ئەوان ڕازین ئێمەش ئەوەمان لەسەرە کە پێمان خۆش بێت. خۆ کفر نییە با ئەم جارە ژنێک لە مێردەکەی گەورەتر بێت. ئەی بۆچی بۆ حاجی عەلی کە دە ساڵ لە تۆ گەورەتر بوو ئەم ئاخ و ئۆفەت نەکرد. ئەو کچە ناسک و نازدارەت دا بەو پیرەمێرە وا نەبوایە ئێستە بۆخۆی کۆشێ منالی ئەبوو. چەند ساڵە وەک دیل و حەپس وا بووە. دایکی خونچە دەستی دا لە سنگی خۆی و گوتی یارەبی پیرۆزی بێت. خوا بە قوربانی بم ئاخری ئەجری دایەوە، خۆ بەوە نییە خونچە گەورەترە لە کوڕەکە بە دەمی خۆشم نەبێت هەر چاوێکی مەملەکەتێک ئەهێنێت.

خاڵە دڵی خۆش بوو و ڕووی کرایەوە و بە زەردەخەنەیەکەی پڕ لە شادی و خۆشی و سەرکەوتوانە دەستی ڕاوەشاند و گوتی هەی ئافەرین! ژنی ئاقڵ و تێگەیشتوو وا ئەبێت. هەی ڕووی دایک و باوکت

سـپی بێـت. ئەقــڵ و مێشــک و بیرکــردنەوە بە خوێنــدەواری و نەخوێندەواری نییە باوکم.
خاڵە ئێوارە سـەرێکی خـونچەی دایەوە و باسـی ڕازیبـوونی دایـک و باوکی پێ گوت و پێشـی گوت کە ئەم چەند ڕۆژە وابزانە گوێت کەڕ بـووە خـوانەکردە و نە گـوێ بـدەرە کەس و نە قسـەی کەس، منـیش بەیـانی ئەگەڕێـمەوە بـۆ کەرکـووک تـاوەکو لەگـڵ ئەحـمەد تەگبیـری خۆمــان بکەیــن و مشــوری مــاڵ و خــانوو بخــۆین. خــاڵە بە زەردەخەنەیەکی خۆشـەوە گوتی تـاکو دوو سێ هەفتەی تر کە ئێمە دێینەوە بۆ لات خەڵکیش تـا ئەوسـا ئیتـر تێر ئەخۆن لە قسـە و بـاس، خـاڵە خواحـافیزیی گەرمـی لەگەڵ خـونچە کـرد و ڕۆیشـت. لە ڕێگـاوە سەرێکی ماڵێ باوکی ئەحمەدیشـی دا بە ئەوانیشـی وا گـوت و هەمـوو شتێکی تێگەیاندن و سوار بوو و کەوتە ڕێ بەرەو کەرکووک.
ئەحـمەد لەسـەر ئـاگر چـاوەڕێی خـاڵەی ئەکـرد... کە گەیشـتە جـێ بە هەڵەداوان چـوو بەپیـریەوە و هەر چـاوێکی بووبـوو بە حەوت چـاو و ئەیویسـت زوو بزانێت کە چـی بـووە. ئەحـمەد هەر زوو تێگەیشـت و زانیی کە دونیـا بە دڵێ ئەوە و ڕووی خۆشـی خـاڵە و قاقالێدانی هەر وا بە خۆڕایی نییە، لەوە ئەچێت کە قسەی زۆر خۆشی پێ بێ بۆم.
خاڵە دوای جوابدانەوەی بەخێرهاتن و سەلام لە کوڕەکان، دانیشت و هەندێ سەروملی ڕاوەشان و پشتێنی بەمـلاو و ئەولادا هێنـا و بـرد و دەسـتی خسـتە سەرشـانی ئەحـمەد و گـوتی ئەحە گیـان پیـرۆزت بێت هەموو شتێک بڕایەوە و تەواو. بەڵام لێم گەڕێ بڕۆمەوە مـاڵێ پشـوو بدەم و بنوم، سـەیرێکی ئەحـمەدی کـرد و پێکەنیی و هەردوو دەسـتی ڕاوەشـاند و گـوتی بەخـوا ئەوەنـدە هـیلاکم ئەڵێـی لە غەزا و حەربەوە هـاتووم ئەوەنـدەم قسـە کـردووە، ئەحـمەد بە خۆشـییەوە گـوتی ئینجـا ئیشێک دەستی موبارەکی تۆی تیا بێت چۆن بە باشـی و ڕێکـی دوایـی نایەت. بەڵام ئاخۆ چەند توورەیان کردبیت. خاڵە بە خۆشـییەوە گـوتی گـوێ مەدەرێ مـایەی سـەفەر سـەلامەتییە ئیتـر دوای ئەوە هەرچـی

بووبێت گرنگ نییە. خاڵە پێش ئەوەی هەنگاو بنێ کە بڕوات بۆ ماڵێ خۆیان ئەحمەد بە تەنگەوەبوونەوە گوتی ئەی توخوا خاڵە گیان دایک و باوکم چۆن بوون؟ خاڵە گوتی ئەوانیش تۆزێ باشتر بوون خوا یار بێت تا ئەچینەوە بۆ سلێمانی دونیا ئەبێتە ماستی مەییو بۆمان.
ئەحمەد بە شەوق و خۆشییەوە پەلاماری دەستوشانی خاڵەی دا و گوتی یاخوا هەر خۆش بیت بۆمان خاڵە گیان خوا لە گەورەییت کەم نەکات. بە چوار پێنج هەفتە خاڵە هەموو تەکبیرێکی بۆ ئەحمەد کرد و خانوویەکی باشی بۆ گرت بە کرێ ئەگەرچی هەندێ دور بوو لە ئوتێل و ماڵی خۆیانەوە بەڵام چاریان نەبوو چونکە خانووی وا باش نەبوو لەو نزیکانە هەمووی خانووی گەورە و کۆنی قەدیمی بوون کە خێزانی دوازدە نەفەرییش لە ناویدا گوم ئەبوون چ جای خونچە بە تەنیا.
ئەگەرچی خاڵە مچە هەر زوو حسابی ئەو تەنیاییەشی بۆ کرد و هێشتا هەر هیچ کارێکیان نەکردبوو ئەو مشووری ئەوەی بۆ خواردن ژنێکی بۆ پەیدا کرد، ژنێکی گەنج کە هەمووی ساڵێک بوو مێردەکەی بە نەخۆشییەکی خراپ ئەمری خوای کردبوو و ژنەکەی بەو گەنجی و هەرزەکارییەوە لە دوای مردنی ئەو مێردەی هەموو خۆشییەکی لە خۆی حەرام کرد و جلی ڕەشی لەبەر کرد و خزایە کونجی ژوورێک لە ماڵی خەسووەکەی چونکە دڵداری و خۆشەویستی خۆی و ئەو مێردەکەی بەناوبانگ و هەموو کەس ئەیزانی.
کچەکە ناوی مەعەسوومە بوو و خزمێکی نزیکی خاڵە بوو و خاڵەش زۆر دڵی بۆی ئەسووتا و زوو زوو لای لێ ئەکردەوە و زۆری خۆش ئەویست بە تایبەتی کە زۆر کچێکی بەحورمەت و بەئەخلاق بوو هەر ئەوە بوو کە بە تەنیا مابووەوە و دایک و کەسی واشی نەبوو.
خاڵە باسی بۆ ئەحمەد کرد و گوتی بەسەزمانە لەتاو مێردەکەی بۆنێکی نابوو بە خەسووەکەیەوە و ئەویش هەروەها. کەچی ئەمە چوار مانگە خەسووەکەشی مرد لە داخی ئەو کوڕە بەسەزمانەی،

ئێستە ئەو فەقیرەش بە تەنیا ماوەتەوە، لە ماڵی ئێمەش هەڵناکات چونکە لەگەڵ ئایشەخانی خوشکم کە دایکیان ئامۆزاشە بە خێری یەک ڕۆژێک پێکەوە هەڵناکەن. خاڵە پێکەنیی و دەنگی نزم کردەوە و گوتی برا هەندێ کە پیر ئەبن بەرچاویان زۆر تەنگ ئەبێت و تەبیعەتیان زۆر خراپ ئەبێت، ئەو هەموو خێر و بەرەکەتە هەیە شکور کەچی خوشکم هەر چاوی بە دوای ئەو بەسەزمانەوەیە و بۆ چوونە حەمام بە گژیدا دێت بەڵام دڵم نایەت لەوە زیاتر دڵی بشکێنم، ئەویش گوناحە و پیرە، ئەبێ قبووڵی کەین. خاڵە پێکەنیی و گوتی وەکو خۆم گەنج بم، هەرچۆنێک بێت خوشکم دوو ساڵێک لە من گەورەترە. خاڵە سەری با دا و گوتی زۆر سەیرە هەمیشە ئەو ماڵەمان پڕە لە میوان و خزمی خاڵۆژنت و هەموویان بە ڕاست و بە چەپ ئەکەن و ئەخۆن کەچی خوشکم هەر هیی مەعسوومەی بەسەزمانی پێ گرانە. لەجیاتیی لە هەموویان زیاتر دڵی بەو بسووتێت، چونکە خزمی خۆیەتی و لێی قەوماوە.

خانوو ئامادە بوو و کەلوپەلی بۆ کڕدرا. خونچەش شتی باش و بەقیمەتی خۆی هەموو حازر کرد و ماڵی پێچایەوە و کەلوپەلی زۆریشی لە خانووەکەدا بەجێ هێشت بۆ دایە ڕەعنا و هەندێ بۆ ماڵی باوک و بۆ ماڵی باوکی ئەحمەد. ئەگەرچی حەبەخان دڵی هەر بە تەواوی نەرم نەبوو، بەڵام وەستا قادر ناچار چوو بەلایەوە و ئیشەکانی بۆ ڕاپەڕاند و خانووەکەشی بۆ دا بە کرێ.

ڕۆژێک خاڵە مچە و ئەحمەد گەیشتنە سلێمانی و بە بێدەنگ و بێ قرە قازییان بانگ کرد و خونچە و ئەحمەدیان لە یەک مارە کرد.

کەلوپەلەکانی خونچەش بە لۆری بار کرا و خاڵە و خونچە سواری ئۆتومبیلەکەی ئەحمەد بوون و یەکسەر بەرەو کەرکووک بوونەوە.

ئێوارە تاریک و ڕوون گەیشتنە کەرکووک. لۆریی ئەشیاکان چووە بەردەرکی ماڵەکەی ئەحمەد. ئەویش لەگەڵ خونچە و خاڵە چوونە ماڵی خاڵە و لەوێ پشوویان دا و نانی شێوانیان خوارد. خاڵۆژن

زۆری پـێ خـۆش بـوو و لەگەڵ ئەو ژنـانەی لە مـاڵەکە بـوون و لە دەوروپشـــتی بـــوون هەر ســـەیری یەکتریـــان ئەکـــرد و ســـەریان سووڕمابوو لە جوانیی بووکێ و نەیانئەزانی کە سـەیری کـام شـوێنی بکەن. نە عومریان لە بیر ما و نە بێوەژنی.
خـونچەش بە شـەرم و تەریقییەوە قسـەی ئەکرد و جـوابی قسـەکانی ئەدانەوە و زوو زوو ســـوور هەڵئەگەڕا و ئەتگـــوت کچێکـــی زۆر منداڵکار و هەرزەکارە کە باسـی شـووکردنی لا ئەکەن، ئەوەنـدە تەریـق ئەبـووەوە و سـەری دائەخسـت. بەینێکـی بـاش دانیشـتن ئیتـر خـاڵە هەستایە سەرپێ و گوتی دەی ئێوەش ئیتر هەسـتن و بڕۆنەوە مـاڵی خۆتان ئێوەش هیلاکن و منیش مانـدوو و هـیلاکم ئەچـم ئەنوم. خـاڵە بۆیە وای گوت چونکە ئەیزانـی کە ئەگەر تـا بەیـانی ئەو دوانە هەر وا بە پێـوە ڕاوەسـتانایە و لەوێ دانیشـتنایە ڕوویـان نەئەهـات بڵـێن بـا بڕۆینەوە ماڵی خۆمان.
لە وەختی خواحافیزیکردنیشدا خاڵە ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی تـۆ بەیـانی هەر لە مـاڵەوە بمێنەرەوە تـاکو مەعسـوومە ئەگـاتە لاتـان بـا خونچەتان بە تەنیا نەبێ. ئەحمەد و خـونچە گەیشتنە مـاڵی خۆیـان و چوونە ژوورەوە، ئەحمەد چراکانی داگیرساند، خـونچەش عەبـاکەی لە خـۆی کـردەوە و چـاوێکی گێڕا و بە دەوروپشـتی خۆیـدا وەک شـتێک ڕووی نەئەهات سەیری ئەحمەد بکات. ئەحمەد هاتە نزیکی و هەردوو دەسـتی کـردەوە و گـوتی خـوایە ئەمە ڕاسـتە! ئەمە مـن و تـۆین و لە مـاڵی خۆمـانین! هەردوو دەسـتی کێشـا بە ئەژنۆکـانی خۆیـدا و گـوتی ئێستەش باوەڕ ناکەم!
ئەحمەد بەرامبەر خـونچە ڕاوەسـتا و هەردوو دەسـتی گـرت و بەرزی کردەوە بۆ دەمی و ماچی کرد و گوتی توخـوا پێبکەنە و مـات مەبە و دەسـتی دایە چەنـاگەی خـونچە و بەرزی کـردەوە و دەمـی خـۆی نـایە سـەر ئەو لێـوە گەرمە کـوڵە بۆنخۆشـانەی و باوەشـی پیـا کـرد و بەربووە سنگ و مل و گەردنـی بە مـاچ هەر وەک شـێت و شـەیدا تـا

خـۆی مڕومەسـت کـرد لە هەنگـوین و عەتـر و گـوڵاوی ئەو سـنگ و بەرۆک و ئەو لەشە نازەنینەی.
بۆ بەیانی مەعسوومە گەیشت و قۆڵی لێ هەڵماڵی، لەگەڵ ئەحمەد و یەک دوو شاگردی ئوتێل بە سەرپەرشتی و فەرمانکردنی خاڵە، ماڵ ڕێک خرا و دامەزرا. شاگرد گەڕانەوە بۆ ئوتێل، لە ڕێگا کەوتنە چرپە چرپ لەگەڵ یەک، ئەو ئەیگوت خاڵە بەخوا برا ئافرەتێکی جوانە. کاک ئەحمەد بۆیە وا هۆش و گۆشی نەمابوو.
ئەویتر ئەیگوت کوڕە ئەمە بێوەژنە و زۆر لە کاک ئەحمەد گەورەترە، ئەڵـێن وەختـی خـۆی کـاک ئەحـمەدی گرتـۆتە بـاوەش ئەوەنـدە لێـی گەورەتـرە. ئەمیـان هەڵـی دایە و ئەیگـوت کـورە ئەوە تـۆ بە ڕاسـتتە؟ بەخـوا ئەوەتـی هەم شـتی وا جـوانم نەدیـوە مـاڵ کـاولە ئەڵێـی بووکەشووشـەیە. خـۆ چـاوی هەر پیـاوی سـڕ ئەکـات. ئەمـی کەیـان جوابی ئەدایەوە و ئەیگوت مردووت مرێ چاویت چۆن وا زوو سـەیر کرد و ئەوەندەت سەرنج دا؟ ئەویش ئەیگوت چۆن کە تێپەڕی و خاڵە مچە بانگی کرد تۆزێ ڕاوەستا بە باشی دیم.
هەر زوو خونچە و مەعسوومە ڕێک کەوتن و کەوتنە قسـە و بـاس و ڕووداو گێـڕانەوە بـۆ یەکتـر، بە چەنـد ڕۆژێـک وایـان لـێ هـات کە ئەتگوت لە دەمێ ساڵەوە ئاشنا و کەسی یەکتر بوون. بە تایبەتی کە هەردووکیان داخ لە دڵ و خۆیان بە غەدرلێکراو ئەزانی.
مەعسـوومە زۆر جـار ئەگریـا و هەنـدێ جـاریش بۆخۆیـان لەگەڵ خونچە خۆیان لە بیر ئەچووەوە و دەستیان ئەکرد بە پێکەنین، گەلێ جاریش ئەگەر ماوەی هەبوایە دەستی ئەکرد بە باسی مێردەکەی و بـۆ خـونچەی ئەگێـڕایەوە کە چـۆن بـوون و چەنـد یەکتریـان خـۆش ئەویسـت و چـۆن ڕایـان ئەبـوارد و ئەم چیـی ئەگـوت و ئەو چیـی ئەگوت. زۆر جار خـونچەش لەگەڵـی ئەگریـا و هەنـدێ جـاریش دڵـی ئەدایەوە. خـــونچە و مەعســـوومە بە مـــاوەیەکی کەم بە تەواوی

شارەزای ژیان و ڕەوشت و خووی یەکتر بوون و زۆر یەکتریان خۆش ئەویست و هەوڵیان دا کە دڵی یەکتر زۆر ڕاگرن.
بەرەبەرە میوانیش دەستی پێ کرد. ئاشنا و ناسیاوی خۆیان و خاڵە و ژنی خاڵەش. ئەمانیش چوونەوە لای ئەوانەی هاتوچۆیان ئەکردن، ڕۆژی جومعانیش ئەوە هەر ئەبوو لەماڵی خاڵە بن.
ئەحمەد لە خۆشییاندا باڵی گرتبوو و تەواوی نوقمی و هەموو ڕۆژگاری بووبوو بە هەنگوینی مانگ، بەڵام لە قووڵایی دڵیدا هەستی بە ناڕەحەتی و پەرۆشییەک ئەکرد و دڵی پڕ ئەبوو بۆ دایک و باوکی و ماڵی خۆیان.
بیری ئەکردەوە کە دایکی چەندی خۆش ئەویست و چۆن هەمیشە هەوڵی ئەدا کە خۆشترین پاروو بۆ دەمی ئەو ببێت و جوانترین و خۆشترین جێگا هەمیشە بۆ ئەو بێت و هەموو هیوا و ئاوات و خۆهەڵکێشانێکی هەر بەوەوە بوو و ئەو بوو، چۆن ئێستە ئەم کەوتۆتە ئەم خۆشییەوە و ئاواتی هاتۆتە دی و ئەو ژنەی کە شەیدای بووبوو گرتوویەتیە باوەشی، شەو و ڕۆژ خۆی مەست و مڕ ئەکات لە گوڵی دەم و لێوی. ئەی دایکی چۆن؟ هەر وا بە عاجزی و دڵگیری بمێنێت؟ ئەو باوەشە گەرم و گوڕەی پڕ لە دڵنیایی و ئارامییەی لە بیر بچیتەوە؟ ئەو ماچ و دەستبەسەراهێنان و دوعا و پەرۆشییەی و ئەو دڵەکوتێ و هەراسانییەی ئیتر هیچ و تەواو؟ ئەحمەد چاوی پڕ ئەبوو لە فرمێسک و بە تووڕەبوونێکەوە مستەکۆڵەی ئەدا لەو شتەی بەردەمی و هەڵەستایە سەرپێ و سەری ڕائەوەشاند و ئەیوت نەء نەء وا نابێت و گوڕی ئەدایە خۆی کە لەم ڕۆژانە بچێت و دڵی دایکی چاک بکاتەوە.
خونچە دوای دوو سێ مانگ سکی پڕ بوو و ئاواتە دێرینەکەی هاتە دی و لە خۆشییاندا جێی بە نەئەگرت و بێزوو و دڵ و تێکچوون و ئەو نەوعە ناڕەحەتییانەی لێ بوو بە شایی و سەیران.
بەیانییەک ئەحمەد ئیتر خۆی پێ نەگیرا و چوو هەندێ لەو شتانەی کڕی کە دایکی حەزی لێ ئەکات و بۆ خوشک و براکانیشی دیاریی

کڕی و بە خونچە و خاڵەی گوت کەوا ئەیەوێت بچیت بۆ سەردانی ماڵی خۆیان و سواری ئوتومبیلەکەی بوو و کەوتە ڕێ بەرەو سلێمانی.
لە ڕێگا بەدەم بیرکردنەوەوە لە وەختی منالّیی خۆی و کە دایکی چەند بەپەرۆش بوو بۆی، لەبەر خۆیەوە سەری ڕاوەشاند و زەردەخەنە گرتی و ئەو وەختەی بیرکەوتەوە کە لە سنفی شەشی ئیبتدائی بوو و دونیا بەهار بوو لەگەڵ مەکتەب چووبوو بۆ سەیران، وەختی نیوەڕۆ لێیان بوو بە با و تۆف و باران و هەور و تریشقە، چۆن دایکی لە سلێمانی وەک شێتی لێ هاتبوو و گریابوو و گوتبووی ئەی هاوار ئێستە کوڕەکەم خنکاوە و چۆن وەستا قادری مێردی شەڕی لەگەڵ کردبوو و گوتبووی کچی خۆ هەر کوڕی تۆ لە سەیران و دەشت نییە هەموو مەکتەبەکەیە ئەویش وەکو ئەو هەموو منالەی تر، چۆن ئاخری دایکی خۆی پێ نەگیرابوو و چووبوو سواری پاسی پوورزاکەی بووبوو بە پاڕانەوە و پێی گوتبوو کەوا بچن بۆ شوێنی سەیرانی مەکتەب و ئاخری لە نیوەی ڕێگا ئوتومبیلی تەلەبەکانیان پێ گەیشتبوو کە ئەگەڕانەوە بۆ شار. ئەحمەد پێکەنیی و لە بەر خۆیەوە گوتی هەر حەیای بردم تا چەند ساڵێک ڕەفیقەکانم گاڵتەیان پێ ئەکردم و بە یەکتریان ئەگوت کاکە ئەزیەتی ئەحمەد مەدەن و زۆر لەگەڵی مەڵێن ئەگینا ئێستە دایکی پێ بزانێت وای لێ ئەکەن ئەبوورێتەوە لەتاواندا.
بەبێ وەستان لە هیچ چایخانەیەکدا و یەکسەر ئەحمەد خۆی گەیاندە سلێمانی و چووە بەردەرکی ماڵی خۆیان ڕاوەستا، لە دەرگای دا و چووە ژوورەوە و وەکو شێت پەلاماری دایکی دا و ماچی کرد و سەری خۆی نا بە سنگیەوە هەروەکو منال، دایکیشی هەموو شتێکی بیر چووەوە و ئەویش باوەشی پیا کرد و فرمێسکی هەردووکیان تێکەڵ بوو.
ئەحمەد لەوەش دڵنیا بووبوو کە دایە ڕەعناش وەکو ژنێکی ئاقڵ و شارەزا و دووربین شووکردن و ژنهێنانی ئەحمەد و خونچەی پێ

خۆش بوو و چونکە ئەحمەدی خۆش ئەویست و هەروەها خونچەشی زۆر خۆس ئەویست و زۆر لێی ڕازی بوو و لە دوای ئەوەی ئەیزانی تازە براکەی زیندوو نابێتەوە کەواتە بۆچی خونچە هەڵکەوتووە و ژنی باشە و هەو هەموو ماڵ و حاڵە چاکەیەوە بۆ بۆ یەکێکی بێگانە بێت و بۆ ئەحمەد نەبێت.

ئەحمەد دڵی دایک و باوکی دایەوە و خوشک و براکانی تێر لاواندەوە و شتی جوانی دانێ و بۆی کڕین و بە دڵنیایی و ویژدانێکی ئارامەوە گەڕایەوە کەرکووک و بە شەوق و خۆشییەوە دەستی دایە کاروباری ژیان و کاروکاسبییەکەی. خونچە بەسەر سکەوە ئەوەندەی تر جوان بوو، بەڵام لە چەند مانگی دواییدا هەندێ قەڵەو بوو ئەویش چونکە لەبەر سکەکەی هەندێ تەممەڵ بووبوو و ئەوەندە نە ئەجووڵایەوە.

هەروەها مەعسوومەش ئەتگوت دانی مارە ئەوەندە زیرەک و لەشسووک بوو و ئەوەندە خونچەش و ئەحمەدی خۆش ئەویست بە جارێک خۆی لە پشوودان و ئیسراحەت بێبەش کرد و هەموو خەیاڵ و هۆش و دڵی دا بەوان و بوو بە دڵسۆزێکی بێوێنە بۆیان، هەموو ئەرکی ئەو ماڵ و میوان و هاتوچۆکەرە لەسەر مەعسوومە بوو و کەسی تر.

خونچە کەوتە سەر ژان و خوا کچێکی جوانی ئێسک سووکی دایە کە ئەتگوت سێوێکن و لەگەڵ خۆی کراون بە دوو کەرتەوە. خوێنگەرمی و شیرینیی ئەحمەدیشی لەگەڵ تێکەڵ بوو، ناویان نا ناز زارا بە ناوی دایکی خاڵە مچەوە، چونکە دایکی تاقانە و زۆر خۆشەویست بوو.

دایک و باوکی ئەحمەد هاتن، خاڵە مچە وا سەری قاڵ بوو ئەتگوت تاقە کوڕەکەی منداڵێکی پەلکەزێڕینەیان بووە. ئەوەندە گەشابووە و ئەوەندەی لە ماڵی ئەحمەد ئەبوو چارەکی ئەوە لە ئوتێل و ماڵی خۆی نەئەبوو. ئاهەنگێکی وا خۆشی بۆ کرد نەبێتەوە. هەرچەند گوتییان خاڵە گیان ئاهەنگ بۆ کوڕ کراوە نەک بۆ کچ. خاڵە گوتی بۆخۆتان گووە و تووڕە بوو و گوتی فەرقی کوڕ و کچ چییە؟ کچی واتان بۆ

هەڵئەدەم کە ئەوەندە بە کار و غیرەت و دڵسۆزی دایک و باوک و بەتەن دڵی هەموو کەسێکەوەن کە سەد کوڕ ئەهێنن، ئەم قسانە چییە! ڕووی ئەکردە خونچە و ئەیگوت توخوا خونچەخان وانییە؟ خونچەش وای دەزانی خوا حەوت کوڕی پەلکەزێڕینەی داوەتێ و خوا دەرکی بەهەشتی بۆ کردۆتەوە و خۆشیی دونیای بەسەرا دابارانـدووە و ئەوەندە دڵی پێ خۆش بوو ئێستە هیچی نەئەکرد بیری لەوە ئەکردەوە کە بۆچی کچە و کوڕ نییە. ئەو تا چەند ڕۆژیش دوای بوونەکەی هەر بڕوای نەئەکرد بۆ قۆناغە و مەلۆتکەی کچەکەی ڕائەپەڕی و بە خەواڵوویی دەستێکی درێژ ئەکرد بۆ قۆناغە و مەلۆتکەی کچەکەی و دەستێکی پیا ئەهێنا هەروەک ئەیویست بڕوا بکات کە ئەمە ڕاستە و خەو نییە و جارێکی تر بە دڵنیایی چاوی لێک ئەنایەوە و ئەنوستەوە. وەختێکیش کە کچەکەی ئەگرت بە باوەشەوە و خەریک بوو شیری ئەدایە هەر بەوەدا ئەگەیشت کە زوو زوو دەم بەرێت بۆ لامل و ڕوومەتە نەرمۆڵە جوانە بۆن خۆشەکەی و ماچی کات و بۆنی کات. ئەو کاتانەش کە ئەو ژانە پێچ پێچە تیژە دژوارانەی پیا ئەهات و چاوە گەشە جوانەکانیان بێ ئارام و پڕ دەرد و ئازار ئەکرد تەنانەت لەو کاتەشدا خۆشی لە دڵی و لە مێشکی نەئەبڕا و هەر گورج دوای بەردانی ژانەکان زەردەخەنەیەکی پڕ هیوا و پڕ ئاوات ئەکەوتە سەر لێوەکانی.

خونچە سەرقاڵی کچەکەی بوو و ئیتر دونیای بیر نەما و بە تەواوی ماڵ و حاڵی بەڕەڵا کرد و بۆ مەعسوومە و وای لێ هاتبوو کە مەعسوومە لێی ئەپرسی ئەرێ خونچەخان ئەمڕۆ چی بخۆین و چی لێ بنێین؟ خونچە بە پێکەنینەوە جوابی ئەدایەوە و ئەیگوت وەڵا مەعسوومە گیان کەیفی خۆتە هەرچییەک بخەیتە بەردەمم ئەیخۆم بە بێدەنگی و مەمنوونی ئەو چاوە جوانەنەشت ئەبم.

میوان بهاتایە خزم بڕۆشتایە بە هیچ جۆرێک خونچە هەقی نەبوو بەسەریانەوە، چی ئەخۆن چی ئەکەن چۆن ئەنوون، هەموو ئەو

ئەرکەش کەوتبووە سەرشانی مەعسوومەی بەسەزمان. هەندێ جار ئەگەر خزمێک لەوێ بوایە بە تایبەتی ئەوانەی ڕاستی و گاڵتەیان تێکەڵ ئەکرد و وەکو توانج ئەیانگرتە خەڵک، ئەگەر لەو جۆرە ژنانە بهاتایە بە میوانیان ئەوسا ڕووی ئەکردە خونچە و پێی ئەگوت کچێ دایکم منداڵداری وا نابێت ئەوە چۆن ئەبێت منداڵەکە هەر نقەی بێت و تۆ ڕاکەی بزانی چییەتی، خەڵک ئەگەر وەکو تۆ منداڵی بەخێو بکردایە ئێستە تۆزی ژنیش نەئەما، وازی لێ بێنە با هەندێک بگری بۆ سنگی باشە بۆ هەناسەی باشە پێی گەورە ئەبێت.

یا ئەگەر میوانەکان دوو کەس بوونایە چ خزمی دوور یان ئاشنا و ناسیاو، لە کاتێکدا ئەگەر خونچە بە هەڵەداوان و پەرۆشەوە ڕای بکردایە بۆ لای منداڵەکەی کە وەختێ ئەگریا ئەوا ئەو دوانە سەیرێکی ئەملاو ئەولای خۆیان ئەکرد بزانن مەعسوومە و کەس دیار نییە ئینجا ئەکەوتنە چرپە چرپ و بە زەردەخەنەوە یەکێکیان ئەیگوت کچێ دایکم عەزرەتییە بۆیە وا ئەکات بەخوا ڕەنگە هەر ئەمەی پێ مابێت.

ئەوی تر جوابی ئەدایەوە و دەستت ئەنایە پەنا دەمی و بە چرپە ئەیگوت کچێ خوشکم ژنەکەی پیرە پیر. پەنا بە خوا کوڕەکەی هەر بە تەواوی پیر کردووە. ئەیەڕۆ ئەحمەد هەموو سەری سپی بووە ئەم نیوەڕۆیە کە هاتەوە ماڵێ هەر نەمناسییەوە. ئەوی تریش هەر بە چرپە ئەیگوت ئاخر قەدیمی ئەڵێن ئەو ژنەی شوو بکات بە پیاوێک لە خۆی منداڵ تر پیاوەکە پیر ئەبێت و خۆی گەنج ئەبێتەوە، پەنا بەخوا ئەمە نییە وایە، خۆ بە درۆیان وا نەگوتووە قسەی قەدیمی وەک نەخشی سەر بەرد وایە.

شەش حەوت مانگێک بەسەر منداڵبوونی خونچەدا تێپەڕیی ناز زازای کچی خرپن و ئێسک سووک بوو، بە جارێ ماڵەکەی گەرم و خۆش کرد. خاڵە هەر بەوەدا ئەگەیشت بووک و شەقشەقە و دیاریی بۆ بێنێت، جاری وا هەبوو شتی وای ئەکڕی و بۆی ئەهێنایەوە کە بۆ منداڵی شەش حەوت ساڵە دەستی ئەدا. ئەگەر خاڵە ڕۆژی چەند

جارێـک ئەو منـاڵەی نەگرتـایە بـاوەش و گـۆرانیی بـۆ نەگوتـایە و نەیخسـتایە سـەر دڵـی ئەوا ئەو ڕۆژە تـاقەتی قسەکردنیشـی لەگەڵ کەس نەئەبـوو. منـاڵەکە وای لـێ هـاتبوو کە خـاڵەی ئەبینـی ئەیـدایە زریـکە زریک لە خۆشـییاندا و ئەگەر بڕۆشـتایەوە دەسـتی ئەکـرد بە گریـان بۆی. منـاڵەکە چەند جارێک نەخۆش کەوت و دیـار بـوو دانـی دەرئەچـوو، خـونچە بە جارێـک لە پەلوپـۆ کەوت و هەرەسـی هێنـا و سەری دونیای لێ هاتەوە یەک و کەس ئیتر نەیئەوێرا قسەشـی لەگەڵ بکـات، خـۆ ئەحـمەد هەر بە جارێـک نەیەوێـرا بچیت بەلایەوە چـونکە داخی دڵی خۆی بەو ئەڕشت، هەر ئەوەندە گوتی قەی ناکە مناڵە منـاڵ نەخـۆش ئەکەون و چـاکیش ئەبـنەوە خـۆ تـۆ خۆتـت کوشـت. خـونچە وەک دەسـتڕێژ پەلامـاری دا و گـوتی تـۆ بـڕۆ هەقت نییە بەسـەرەوە ئەزانم بۆ وا ئەڵێیت ئیسراحەت و کەیفت لێ تێک چووە، کەس بە تۆی نەگوتـووە وەرە دانیشـە بە دیارمـانەوە، ئـاخر فەرقـی دایـک و بـاوک ئەوەیە کە پیـاو هەر لە ئیسـراحەت و خۆشـیی خـۆی ئەگەڕێـت. ئەحمەدی بەسەزمان ئیتر بێدەنگ ئەبوو لە خوای ئەویست کە وەکو خۆی لێ بێتەوە. مناڵیش ئەگریا و تای گەرمـی لـێ هـاتبوو ئـاو و لیک بە دەم و لووتیدا ئەهاتە خوارێ و سرەوتی نەبوو، خـونچەش لەگەڵـی ئەگریـا. مەعسـوومە ئەهـات و دڵـی ئەدایەوە و هەنـدێ منـاڵەکەی وەرەگرت و بە باوەش ئەیهێنا و ئەیبرد و گۆرانیی بۆ ئەگوت، مناڵەکە مات ئەبوو و چاوی ئەچووە سەریەک و نیو سـەعاتێک ئەنوست لەپڕ ئەیدایەوە زریکە و گریـان. تـاکو ئەو منـاڵە سـەری دانەکەی دەرەچـوو خونچەش ڕۆحی لەگەڵ دەرەچوو و نیوە گیان ئەبوو.

خـونچە ڕەنگـی هەڵبزرکـابوو ئەو سـەر و پـرچە جـوانەی بە هەفـتە دانەئەهێنا، تا کچەکەی چاک نەبووەوە سەری نەشت و جلی نەگۆڕی.

منـاڵ چـاک بـووەوە و ئێـوارەیەک لەگەڵ ئەحـمەد دانیشـتبوون دڵیـان خـۆش بـوو و قسـە و باسـی پێکەنـین و خۆشـییان ئەکـرد، ئەحـمەد ڕووی کـردە خـونچە و بە گـاڵتەوە گـوتی ئەزانـی نـاز زازا گیـان ئەم

چەند ڕۆژە چاک لەڕولاوازی کردی. خونچە لچێکی هەڵقورچاند و کچەکەی دا بە شانیدا و گوتی چییە بەقوربان زەعیف و قەد باریکت بە دڵە؟ ئەحمەد وەکو لە بانێکی بەردەیتە خوارەوە ڕووی تێکرد و بە زەردەخەنەیەکی کاڵەوە گوتی ئینجا لە تۆ قەد باریکتر و ناسک و جوانتر هەیە لەم دونیایەدا؟ چووە نزیکی و خەریک بوو دەست بکاتە ملی، خونچە خۆی لە دەست ڕاپسکاند و بە دەستێک توند کچەکەی گرتبوو و بە دەستێکیش ئەحمەدی لادا لە ڕێگای خۆی. ئەحمەد مات بوو و دڵی شکا، بەڵام نەیبردە سەر خۆی و سەیرێکی سەعاتەکەی کرد و گوتی ئۆ درەنگە ئەبێ بڕۆم ئیشم هەیە و بەبێ خواحافیزی چوو و سواری ئۆتومبیلەکەی بوو و کەوتە ڕێ بەرەو ئوتێل. لە ڕێگا خەیاڵی ڕۆیشت و ناڕەحەت بوو لەم جۆرە ڕەفتارانەی خونچە کە دوای منداڵبوونەکەی فێر بووە و بە جارێک گۆڕاوە و وازی لەم هێناوە و هەر گوێشی ناداتێ و چەند جارێکیشە فێر بووە ئەقیژێنێ بەسەریدا و چۆن هەموو هۆش و خەیاڵ و ژیانی بووە بەم منداڵە، چۆن هەر وا دێت و ئەڕوا وەختە شێت بێت کە تۆزێ ماوەی بداتێ کە دانیشێت لەگەڵی و دەستێک بکاتە ملی و لێی نزیک بێتەوە و ئەویش هەر بیانوو ئەدۆزیتەوە و ڕائەکات لە دەستی و توورە ئەبێت لێی و لەم ڕۆژانە چەند جارێک توانجیشی تێگرتووە.

ئەحمەد دڵگیر بوو. بەڵام ئەوەندەی خونچەی خۆش ئەویست هەر بە چاوترووکاندنێک هەموو دڵ شکاندن و دڵگیرییەکەی لە بیر ئەچووەوە و هەمیشە مەرایی ئەکردن و بە دەوروپشتیدا ئەهات و داخوازییەکانی بۆ جێبەجێ ئەکرد.

ئەحمەد هەندێ جار لەگەڵ خاڵە کە هەر خۆیان بە تەنیا بوونایە باسی ئەوەیان ئەکرد کە چۆن خونچە دونیای بیر نەماوە لەبەر کچەکەی و خاڵە دەستی ئەکرد بە پێکەنین و قاقای بەرز ئەبووەوە دەستی ئەدا بە یەکدا و ئەیگوت ڕاستت ئەوێت منیش لەتاو ناز زازای

دایکم خەریکم دونیام لە بیر نامێنێ و ئەو ڕۆژەی تێر ماچی نەکەم وەک گێژ وامە.
خونچە وردە وردە خەریک ئەبوو تووشی گرێ ئەبوو لەوەی کە شووی کردووە بە ئەحمەد کە دە ساڵ لەو گەورەترە، لەبەر ئەوە هەرچەندە دوو کەسی ناسیاوی بدیایە پێکەوە قسە ئەکەن و یان چرپە چرپ ئەکەن وەیەزانی ئەمە باسی ئەو ئەکەن و ئەیگرتە دڵ و قسەی نەئەکرد، ئەو قسە و ڕووداوانەی لە دڵی خۆیدا کۆ ئەکردەوە و بەین بەین ئەگەر ئەحمەد قسەیەکی بکردایە وەکو باسەکەی ئەو ڕۆژەی کە وڕ بوو لەوەی کە ئەحمەد باسی قەڵەوی و زەعیفیی کرد. یان قسەیەکی گاڵتەی تر لەپڕ ئەتەقی بەسەریدا و دەستی ئەکرد بە شەڕ و بۆڵەبۆڵ و یاخود ئەگەر ئەحمەد ئیشی زۆر بووبوایە و هەندێ درەنگتر لە جاران بهاتایەوە ماڵێ، خونچە خۆی مۆن و گرژ ئەکرد و ئەکەوتە توانجتێگرتنی، وەکو ئەیگوت ها دیسان کێت بەڕێ کرد و کێت گەیاندە ئیستگەی شەمەندەفەر؟ کێت بردە لای دکتۆر؟ مسافری زۆر ئەمڕۆ هاتبوون کچۆڵەیان لەگەڵ بوو؟
ئەحمەدیش هەر ئەوەندەی نەئەما کە شەق بەرێت لە داخاندا و لە دڵی خۆیدا گاڵتەی بە دونیا ئەهات و ئەیگوت دەوەرە توخوا ئەم چیم پێ ئەڵێت و منیش وا ئەزانم خوا کەسی کەی دروست نەکردووە لەو زیاتر. دەوەرە چۆن من شێت و شەیدای ئەوم و ئاواتم قسە و پێکەنینێکی ئەوە کەچی چاو چیم پێ ئەڵێت. ئەحمەد سەری ڕائەوەشاند و لە ژێر لێوەوە ئەیبۆڵاند و ئەیگوت بەخوا ژنێکی بێئەقڵە! گوایا نازانێت و هەست ناکات کە چەندم خۆش ئەوێت و چەند ئەیپەرستم! ژنی چی و کچی چی؟!
خونچە لەوە ئەچوو کە بیەوێت پەلە بکات و تاکو پێی بکرێت منداڵی تری هەبێت، بۆیە هێشتا کچەکەی ساڵی تەواو نەکردبوو دیسان سکی پڕ بووەوە. ئەویش لەبەر ئەوەی دەردی ژنەکان ئەیانچرپاند عەزەرەتیە بۆ منداڵ و لە سەرێکی تریشەوە ئەیویست ئەحمەد

سەرقاڵ بکات و ئەوەندەی تر بیبەستێتەوە بە خۆیەوە. خونچە کەوتبووە واسواس و دوودڵییەکی نابەجێوە، چونکە وا ئەهاتە خەیاڵی کە ڕەنگە ئەحمەد تێری لێ بخوات و ئەم خۆشەویستی و ئاشقییەی هەر هەڵچوون و خەیاڵێکی دەمودەست بووبێت و تا سەر وا نەمێنێ و قسەی دایک و کەسی کاری تێبکەن و لە دوارۆژدا بیر لەوە بکاتەوە کە چاو بە دوای ژنی تردا بگێڕێ و ژنێکی تر بهێنێ.
دیارە خەیاڵەکانی خونچە هەموویان زۆر نابەجێ بوون و زۆر دوور بوون لە ڕاستی، چونکە ئەحمەد ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ئاشقی ئەبوو و زیاتر خۆشی ئەویست و خۆشترین کات و ساتی ئەوە بوو کە لەگەڵ خونچە بوایە و گوێی لە قسەی بوایە و چاوی لە قەد و باڵای بوایە.
خونچە بۆ جاری دووهەمیش هەر گەشابووەوە لە خۆشیی منالی دووهەمی کە بەڕێوە بوو. کچەکەشی پێی گرتبوو و بزێو ببوو و بە تەواوی هۆگری مەعسوومە ببوو چونکە خونچە هەر بە تەواوی خۆی بەردابووەوە و تەمەڵ بووبوو و تاقەتی ئەمسەر و ئەوسەری نەبوو کە لەگەڵ کچەکەی بێت و بڕوات هەر بە دوایەوە بێت، لەبەر ئەوەش خەریک ئەبوو قەڵە و قورس ئەبوو، ئەحمەدیش هەر لە دوورەوە ئاخی هەڵدەکێشا و زاتی نەبوو کە پێی بڵێت تۆزێ بجووڵێرەوە بۆ وا لە خۆت ئەکەیت، سەری سووڕئەما لەوەی کە ئەم خونچە ناسک و نازەنینە چۆن وا خۆی بەرەڵا کردووە و گوێ ناداتە خۆی و هیچ شتێکی لەم دونیایەدا لا بەنرخ نییە منال و منالبوون و تووشی وا گرێیەک بووبوو کە بە هیچ جۆرێکیش کەس نەیەتوانی باسی خۆی لا بکات کەوا بۆچی گوێ ناداتە خۆی و هەر منال و منالیەتی! ئەحمەد لە سەرێکیشەوە بەزەیی پیا ئەهات و هەستی بە گرێ و ناڕەحەتییەکەی ئەکرد و بە دڵ و بە گیان هەوڵی ئەدا کەوا یارمەتیی بدات و دڵی ڕاگرێت و چاو لەو کردەوە و توانجانەی بپۆشێت.
هەرچەندە خالە گەلێ جار بە لایەنی گاڵتەوە جنێوی ئەدا بە منال و ئەیگوت توخوا حەیف نییە تۆ وا خۆتت بیر چۆتەوە لەبەر منالی

سەگباب خاڵۆژنیش ئەیکردە پێکەنین و ئەیگوت بەرۆکی بەردەن و وازی لێ بێنن دایکی کچ وا قورس و تەمەڵ ئەبن مەعلووم دیسان خونچە کچێکی پێیە، خونچە ئەیدایە پێکەنین و ئەیگوت وەڵا ئەگەر بە تەممەڵی و تووڕەیی بێت کەواتە لە سەدا سەد دیسان کچم ئەبێت، بەڵام خەتای مەعسوومەشە ناهێڵێ هیچ بکەم و دەست لە هیچەوە بدەم و ئەکەوتە مەتح و سەنای مەعسوومە.

بەیانییەک ئەبوو خونچە لەگەڵ خزمێکی خاڵۆژن بچێت بۆ سەر تەعزییەی ناسیاوێک. ئەحمەد بە هەلی زانی کە قسە لەگەڵ مەعسوومە بکات و سکاڵایەکی خونچەی لا بکات، چونکە ئەیزانی کە خونچە چەندی ئەو کچە خۆش ئەوێت و چەند دڵی ڕائەگرێت و چەند دڵی بۆ ئەسووتا، بۆیە هەندێ باسی خونچەی بۆ کرد و باسی وەسواسی و قسە نابەجێکانی بۆ کرد و باسی سیحەت و قەڵەویی بۆ کرد و گوتی بەشکم لەمەودوا هەوڵی ئەوەی لەگەڵ بدات کە شتی چەور و ئەو شتانەی نەداتێ کە خەڵک پێی قەڵەو ئەبن. پێشی گوت کەوا نەزانێت چەند خونچە حورمەتی ئەگرێت و خۆشی ئەوێت بۆیە ئەم قسانەی بۆ ئەکات. ئەحمەد قوڕگی گیرا و خەریک بوو چاوی پڕ ئەبوو لە فرمێسک و گوتی ئەزانی منیش چەنم خۆش ئەوێیت و چەند حورمەتت ئەگرم وەڵا بەقەد هەموو خوشکەکانم خۆشەویستی لە لام، مەعسوومەش دڵی پڕ بوو و دڵی ئەحمەدی دایەوە و گوتی بەسەرچاو ئەی بۆ زوو وات پێ نەگوتم، من خۆشم هەستم بەو گۆڕینەی کردووە، بەڵام حەزم نەئەکرد خۆم بخەمە ناو ئیشی تایبەتی ئێوەوە، ئەمگوت نەوەکو بڵێ تۆ هەقت چییە.

ئەحمەد چووە سەر ئیشەکەی و مەعسوومەش کەوتە ئیش و کاری ناوماڵ و بەدەم ئیشەوە بیری لە خونچە کردەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی بەڕاستی ئینسان زاڵمە وەکو ئەڵێن دە توخوا کوڕی وا باش و دڵسۆز و فیداکار لە کوێ پەیا ئەبێت کەوا ڕۆحی بە تاڵی مووی سەرتەوە بێت کەچی تۆش وای ڕەفتار لەگەڵ بکەیت.

مەعسوومە دڵی پڕ بوو و خۆی و مێردەکەی بیر کەوتەوە کە چۆن وەکو ئێستە خەریکە سەری دونیای لێ دێتەوە یەک لەبەر ئەوەی هەست ئەکات ژنەکەی خەریکە گوێی ناداتێ و ئەویش وا خۆشەویست بوو لای مێردەکەی خۆی و بەپێی حاڵی خۆیان چەند دڵی ڕائەگرت، حەزی ئەکرد ئەگەر بە دەستی بوایە هەموو خۆشی دونیایی بۆ بهێنایەتە ژووری و بەردەستی، چۆن ئێواران کە لە وەستایی و بەنایی ئەهاتەوە دەستی ئەکردە ملی و ماچی ئەکرد و پێی ئەگوت حەسامەوە و هیچ هیلاک نیم و هیچ گەرماشم نەبووە. مەعسوومە چاوی خۆی سڕییەوە لە فرمێسک و هەندێ مات بوو دوایی پەلاماری ئیشەکانی دایەوە. مەعسوومە لەچکەکەی سەری توند کردەوە چونکە هەستی کرد کە سەری هاتە ژان، سەرێکی با دا و لە بەر خۆیەوە گوتی ئەمەتا! بۆیە هەنێ جار لەناکاو و بەبێ هیچ ئیشێک و بیانوویەک ئەدۆزێتەوە و ئەمنێرێتە ئوتێل، کە گەڕامەوە هەر ئەمهێنێت و ئەمبات تاکو قسەم لێ دەربێنێت، کاکە ئەحمەد لە کوێ بوو؟ چیی ئەکرد؟ خەڵکی زۆر لێ بوو یان کەم؟ مەعسوومە سەری ڕاوەشاند و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی کچەکە! چەند لەسەرخۆ و بە ئاقڵی هەموو قسەکانم لێ دەرئەهێنێت بێ ئەوەی هەست بکەم کە ئەمە نیازی چییە و بۆچی ئەم پرسیارانەم لێ ئەکات. مەعسوومە بەدەم زەردەخەنەوە سەری ڕاوەشاند و گوتی ئەحمەدی چی ڕەبب خوایە لە دایکی خۆی نەسێنێ بەخوا بە شەرت کوڕە و پیاوە، پیاوی وا بەناموس و بەحورمەتم کەم دیوە، دە وەرە توخوا بە ڕاستی دونیا سینەمایەکی زۆر سەیرە.

خونچە گەڕایەوە لە ماڵە تەعزییەکە. مەعسوومە بە ڕوویەکی خۆشەوە چوو بەپیریەوە و پەنجەی خستە سەردەمی خۆی و گوتی ناز زار گیانیش ئێستە خەوی لێ کەوتووە خەوی خێر بێت. خونچە بە ئەسپایی لێی پرسی کە نازی کچی چیی کرد و چیی خوارد و مەعسوومەش هەر بەدەم هاتنە بەرەو هەیوان و بەرەو ژوور بۆی

گێڕایەوە کە وا نـانی باشـی داوەتـێ و سـەری شـتووە و بـۆ خـۆی نوستووە. خـونچە چاوێکی گێرا بە مـاڵەکەدا و دیی کە چەنـد ڕێک و پێـک و پـاک و تەمیـزە دڵـی خـۆش بـوو و گەشـایەوە لە خۆشـیی مەعسـوومە و بـۆنێکی قـایمی هەڵمـژی و گـوتی ئەوە چیـت لـێ نـاوە بۆنێکی زۆر خۆش دێت و چووە پێشەوە پەلاماری دا و دەستی کردە ملی و گـوتی ئەرێ بەڕاسـت ئەگەر تـۆ نەبوویتـایە مـن چیـم ئەکـرد و یەک دوو ماچی مەعسوومەی کرد و گوتی ئۆ خـوایە لێت بەزیـا بێت وەکـو تووشـت کـردم بە تووشـی ئەم کـچە باشـەوە لە ڕۆح زیـاتر خۆشم ئەوێت. ئەویش دوو سـێ جـار خـونچەی مـاچ کردەوە و ئیتـر چوونە بەرەو ژوور. خونچە سەرپۆشـەکەی داگرت و سـەرکڵاوەکەی کـردەوە و گـوتی وەی دایە سـەرم هـاتە ژان ئەم کـڵاو و مـڵاو و سەربەستانە چەند قورس و ناخۆشن هەرچەند سـەر ئەبەستم سـەرم دێـتە ژان، خەریکـی جـل داکەنـدن و جلگـۆڕین بـوو کە ڕووی کـردە مەعسـوومە و پرسـیی ئەرێ ئەحـمەد چـووە دەرێ؟ مەعسـوومەش بە هەلی زانی کە قسە بکات و لەسەر ئەحمەد بکاتەوە بە تـایبەتی هێشـتا جێ ماچەکانی خـونچە وشـک نەبووبـوونەوە بە ڕوومەتیەوە و زانیـی کە ئەتوانێت هەندێ نازی بەسەردا بکات. لەبەر ئەوە خۆی گورج کـرد و هەندێ مات بوو و گوتی کاک ئەحـمەد ئەڵێیت؟ ئۆ ڕۆحـم دەرچێت بۆی.

خـونچە لەپـڕ وەرگەڕا و بە شـپرزەییەوە گـوتی بـۆ؟ چـی بـووە؟ مەعسـوومە گـوتی وەڵا لە خـۆت بپرسـە تـۆ ئەزانـی چـی بەو فەقیـرە ئەکەیت و چۆن ڕەفتاری لەگەڵ ئەکەیت؟ ئەرێ بە ڕاسـت ئەوە چۆن دڵـت دێـت؟ خـونچە ئـاهێکی هـاتەوە بەر و سـەری داخسـت و بە بزەیەکی ژێر لێوانەوە گوتی بۆ؟ چیم لـێ کـردووە؟ مەعسـوومە گـوتی چـۆن چیـت لـێ کـردووە مەگەر بەسـەزمانە هەر ئەوێرێـت قسـەیەکت لەگەڵ بکـات؟ چـاک بڵێـت هەر تـووڕە ئەبیـت خـراپ بڵێـت هەر تـووڕە ئەبیت، ئەو ئەوەندەی خـۆش ئەوێیـت و بە تەنـگ دڵـتەوەیە و هەمیشـە

چاوی لە دەمتە بزانیٚ چی ئەڵێیت و چی ئەمر ئەکەیت، مەعسوومە کردی بە گاڵتە و پێکەنین و گوتی وەڵا بەسەزمانە هەر ئەوەی ماوە نوێژت بۆ بکات تۆبە و استغفرالله. خونچە پێکەنیی و گوتی دەبڕۆ بڕۆ نانەکە تێکە و ئەوەندەی لەسەر مەکەرەوە، وەیش فەقیرە چەند گوناحە!

مەعسوومە بەدەم چوونە بەرەو چێشتخانەکە گوتی ئەرێوەڵا زۆر گوناحە کە وای لیٚ ئەکەیت دڵم خەریکە ئاگری تێبەرئەبێت بۆی.

خونچە لە جل گۆڕین بووەوە و شوێنی کەوت بۆ چیشتخانەکە و پێکەنیی و گوتی ئەوە بەڕاستتە؟ کچی تۆ چووزانی ئەوە چی لە ژێر سەرایە و فەقیرۆکە مەبینە. خونچە دەستی شت و دانیشتە سەر سفرە و قۆڵی لیٚ هەڵماڵی و گوتی بێنە با هەر بخۆم شەرت بیٚ ئەوەندە بخۆم تاوەکو بەقەد فیلێکم لیٚ دێت چونکە ڕقی لە قەڵەوە. مەعسوومە بەدەم شت دانانەوە گوتی ئینجا خۆت زەرەر ئەکەیت و دوور لە تۆ تووشی هەزار نەوعە نەخۆشی ئەبی، بێجگە لەوەی دیمەنی ئەو لەش و لارە جوانە شیرینە تێک ئەدەیت توخوا حەیف نییە؟ خونچە سەیرێکی نانی سەر سفرەکەی کرد و گوتی ئەوە چییە ئەڵێی ئەحمەد ڕای سپاردوویت بزانم چێشتەکانت وەکو ڕۆژان نییە لە هیی نەخۆش و خەستەخانە ئەچێت؟ مەعسوومە پێکەنیی و بە دڵسۆزانەوە و نازەوە گوتی لەمەودوا ئەوە لیٚ ئەنێم کە بزانم قازانجی تۆی تیایە و سیحەتت تێک نادات و ئەبیٚ بە قسەم بکەیت و ئەبێت لەگەڵ ئەحمەدیش ڕەفتار بگۆڕی و دڵی ئەوەندە نەشکێنی، مەعسوومە لچی شۆڕ کرد و دایە پرمەی گریان و گوتی ئەگینا بە قەبری ئەو جوانەمەرگە سەری خۆم هەڵدەگرم و هەر لە شارەکشدا نامێنم، زۆر جار لە خوا دەپاڕێمەوە و سوپاسی ئەکەن و ئەڵێم خوایە گیان ئاخری ئەجرت دامەوە کە ئەم ژن و پیاوەت کرد بە کەسوکارم ئەوەند باشن و منیش ئەوەندەم خۆش ئەوێن، مەعسوومە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی ناتوانم تۆ بە عاجزی ببینم، کاک

ئەحمەدیــش لە بــاوک و بــرام زیــاترە و خەریکــن ســەر لە منــیش ئەشێوێنن. خونچە دەستی ڕاکێشا و دەستی کردە ملی و گوتی توخوا مەگری و ئەویش دەستی کرد بە گریان و گوتی دڵی خۆت ناڕەحەت مەکە شەرت بێ ئیتر بە قسەت بکەم. ئەو ڕۆژە تاکو ئێوارە ئەحمەد دەرنەکەوت، ڕۆژانی تر چەند دڵی ناڕەحەت ببوایە تاقەتی نەئەگرت هەر ئەهــاتەوە مــاڵێ و ســەری ئەدا و لە مــاڵەوە پشــوویەکی ئەدا. خــونچە کــێچ کەوتە کــۆڵی و لەبەر مەعســوومەش کە قەولــی لەگەڵ کردبوو دڵی نەئەهات قسە بکات، بەڵام لە دڵدا زۆر تووڕە و ناڕەحەت بوو کە سـەعات بـوو بە نزیکی پێنجی ئێوارە ئیتر خونچە خۆی پێ نەگیـرا و گـوتی دە بـزانە خەریـکە نیـوەڕوانیش خـۆی ئەدزێـتەوە و نایەتەوە، ئاخر تۆ ئەڵێیت شەڕ نەکەم و قسە نەکەم، باشە تۆ ئەمەیت بە دڵە؟

مەعســوومە دەســتی لە ســنگی خــۆی دا و ڕاپەڕیــی و گــوتی ئینجــا بەشـکم ئیشـێکی بۆ بـووبێ، یـا چـووبێتە دائیـرە و مـائیرە، ئیتـر خـاڵە گیــان ئەناســی هەزار کــون و کەلەبەری هەیە ئــاخۆ کــاک ئەحــمەدی هەڵپێچاوە و بۆ کوێی بردووە، ئەوە نییە خۆشی دیار نەبوو ئەی ئەو چــۆن تــاقەتی گرتــووە ئەمــڕۆ مــاچی نازەخــانی نەکــردووە؟ خــونچە لچێکی هەڵقورتاند و گوتی بـا وابێت وەکو ئەڵێیت و چیتر قسـەی بە ئاشکرا نەکرد و لە دڵی خۆیدا هەزار و یەک خەیاڵی کردەوە.

– کچـی خـوا ئەزانێت دیسـان بەغـدادی و مەغـدادی هـاتوون و مینـی جـوب لەبەریـان لەگەڵە، ئێسـتە سـەری خـۆی قـاڵ کـردووە، ژووریـان چــۆن بێــت و کــام ژوور باشــە بۆیــان و ئەوان چەنــد کەس و چــی ئەخـۆن و لە خـۆیەوە خـۆی ئەخـاتە ئیشـی کوڕەکـانەوە، دە بڵـێ تـۆ هەقت چییە بەسـەرەوە خۆ ژوور دابەشـکردن ئیشـی تۆ نییە. وەکـو ئەو جــارەی چــووین بــۆ شــەقڵاوە و لە ڕێگــا ئۆتــومبیلی ئەو مــاڵە بەغدادییە عارەبە پەکی کەوتبوو چۆن خۆی کرد بە فیتەر و وەسـتا و ئـێمەی لەبەر قـرچەی ئەو گەرمـایە بەجـێ هێشـت و خەریـک بـوو

بپـڕووکێین و چـۆن ئەو کـچە عارەبـانەی تێئـاڵابوون هەر ئەوەنـدەی نەمابوو بە ئاشکرا باوەشی پیا بکەن، تاکو خاڵە هـاواری پێ کەوت و لێی تووڕە بوو ئینجاش تـاکو بـۆی نەخسـتنە ئیش وازی لـێ نەهێنـان. دەنگی دەرکی حەوشە خـونچەی لە خەیـاڵ دا، مەعسـوومە بە ڕاکـردن چـوو بیکـاتەوە. مەعسـوومە هەنـێ دواکەوت و دوای نەختـێ لەگەڵ شـاگردێکی ئـوتێلەکە هـاتن بەرەو ژوور. مەعسـوومە سسـت و مـات بووبـوو گـوتی وەی ڕۆحـم دەرچێـت ئەوە کەی هەر گـوتم نەکـراوە خـاڵە گیـان سـەر نەدات بـۆیە کـاک ئەحمەدیـش دەرنەکەوت، ئەیەڕۆ خوایە ئینجا چی بکەین. خونچە دڵی داخورپا و ڕاپەڕیی و گوتی لە ڕێی خودا چی قەوماوە، سست بوو ڕەنگی پەڕی، کە زەنگەکەی لێ دا بە هەموو ئەقڵێکی لای وابوو ئەوە ئەحـەد بوو هاتەوە یان خاڵەیە.

مەعسوومە لە دوورەوە کە دیی خونچە تێک چووە و شـپرزە بـوو بە مـاتییەکەوە گـوتی کـاک حەسـەن ئەڵێـت خـاڵۆژن لە خەسـتەخانەیە و هـیلاکە، لە بەیـانییەوە خـاڵە و کـاک ئەحمەد بە دیـاریەوەن لەوێ و تـا ئێستەش دەمیـان لە نـان و ئـاویش نەداوە و کـاک حەسـەن هـاتووە بە دواتـا کە تـۆش بچیـت. خـونچە ڕاپەڕیـی و کێشـای بە خۆیـدا و بە نـاڕەحەتییەکی زۆرەوە گـوتی وەی خـوا نەکـات بەڵام لـێ دوور بێـت خـاڵۆژن گیـان ئەی ئەوە بـۆ لە بەیـانییەوە کەس قسـەی نەکـردووە. خونچە گورج هەستایە سـەرپێ و بە دەسـتێکی لەرزۆک و پەلەپەل و بە یارمەتیی مەعسوومە خۆی کۆ کردەوە و چـوو سـواری ئوتومبیل بوو بەرەو خەستەخانە.

خـونچە خـاڵۆژنی زۆر خـۆش ئەویسـت و ئەوەنـدە هـۆگری بووبـوو و دڵـی پـێ ئەکـرایەوە وای دەزانـی دایـک و خوشـک و هەمـوو کەسـی لێرەن ئەوەندە لەگەڵی ڕاهـاتبوو و ژنێکی زۆر دڵسـۆز و بە تەنگیەوە بـوو، لە ڕێگـا خەیـاڵی پەرشـوبڵاو بـوو لە دڵـدا تەریـق بـووەوە کە چ بوختـانێکی بە ئەحـمەدی فەقیـر کـرد و لە بەیـانییەوە لە دڵـی خۆشـیدا هەر قسەی پێ ئەڵێت کەچی ئەحمەدیش خەریکی چییە!

خونچە زوو زوو لە ناو ئوتومبیلەکەدا ئەیکشا بە خۆیدا و هەر ئاخ و ئۆفی بوو تاوەکو گەیشتە خەستەخانەکە.
بە پەلە دابەزی و لەگەڵ کوڕەکە چوونە ژووریّ و ژووراوژووریان کرد بەڵام هەر زوو خونچە تێگەیشت کە خاڵۆژن تەواو بووە و نەماوە چونکە ماتەمینی خزم و ئاشنا کە لە هۆڵەکە ڕاوەستا بوون و چاوی سووری ئەحمەد و سەرداخستنی خاڵە هەمووی بۆ ئاشکرا کرد.
لەبەر تەعزییە و مردنی خاڵۆژن خزم و کەسێکی زۆر بەسەر ئەحمەد و خونچەدا داباری، دایک و باوکی ئەحمەد و خونچە و دایە ڕەعنا و گەلیّ خەڵکی تریش.
بەینێکی باش ئەحمەد و خونچە سەریان قاڵ بوو و بە دەوری خاڵەدا ئەهاتن و دڵیان ئەدایەوە و هەر ئەوەندەیان نەمابوو کە خاڵە بگرنە کۆڵیان و وایان لە خاڵە کرد کە بە ماوەیەکی کەم برینەکانی سارێژ ببن و سەر دانەوێنێت بۆ ئەجەل و قەزا و قەدەری خوای گەورە و شوکری خوا بکات لە کوڕ و کچی نەبوو خوا کوڕێکی وەکو ئەحمەد و کچێکی وەکو خونچەی داوەتیّ.
خاڵە بە تەواوی ئیتر گواستیەوە ماڵی ئەحمەد و جارێکی تر دڵی نەهات سەر بکاتەوە بە ماڵی خۆیاندا چونکە هەرچەندە خاڵە بە تەنیا ئەبوو ئەو ژنە باشەی بیر ئەکەوتەوە بەکوڵ بە دڵ دەستی ئەکرد بە گریانن لەبەر ئەوە بۆ پاککردنی ماڵەکەی و هەڵبژاردنی کەلوپەلەکانیشی هەر خاڵە نەچوو، هەموو شتە باشەکانی گواسترایەوە بۆ لای ئەحمەد و خونچە، کەلوپەلەکانی تریشی هەمووی دابەش کرد بەسەر خزمەکانی خۆی و ژنەکەی دا.
دوای سیّ مانگ دیسانەوە خونچە کەوتە سەر ژان و ئەم جارە دڵی گیرابوو و چاوی پڕ بوو لە فرمێسک چونکە منداڵبوونەکەی پێشووی بیر ئەکەوتەوە کە خاڵۆژن لە ژووری دانیشتبوو و وەکو دایکێکی دڵسۆز ئارەقەکەی ئەسڕییەوە و قسەی خۆشی بۆ ئەکرد تاکو وزەی

بەرز ببوایە و ژانەکانی لە بیر چوونایەوە. خونچە قورگی گیرا و لە دڵی خۆیدا نوکتەکانی خاڵۆژنی بیر ئەکەوتەوە کە جاری پێشوو ژان ئەیگرت ئەو پێی ئەگوت گوێ مەدەرێ ئەم وردە ژانانە نوقرچی ماڵە خەزوورانی پێ ئەڵێ.

ئەوەندەی پێ نەچوو کە خونچە ئەم جارەش کچێکی تری جوانکەلەی بوو و ئەوەندەی تر ماڵەکەی گەرموگوڕ کرد و دڵی دایکی پڕ کرد لە ئومێد و هیوا و بڕوابەخۆکردن.

خونچە هەندێ ڕەوشت و خوی گۆڕا و لەگەڵ ئەحمەد وەکو جارانی لێ هاتەوە و شەڕوشۆڕ و دەمەقاڵێ و تیر و توانجی ئیتر نەما، بە تایبەتی کە خاڵە لەگەڵیان ئەژیا و ئەویش هەوڵی ئەدا کە دڵی نارەحەت نەکات و هیچ کارێک نەکات کە ئەو پێی سەغڵەت بێت.

لە دوای بەینێکی باش خاڵە بۆ چەند ڕۆژێک چوو بۆ سلێمانی بۆ سەردانی خزم و کەسوکار. خونچەش کە ترسی خاڵەی لە دڵدا نەمابوو، لەبەر ئەوە ئەو بەیانییە تووڕە ئەهاتە بەرچاو. ئەحمەد چەند جارێک قسەی لێ پرسی، خونچە خۆی گێل کرد و جوابی نەدایەوە. مەعسوومە خەریکی ئیشەکانی بوو و سەری قاڵ بوو، ئەحمەدیش خۆی گۆڕی کە بڕوات بۆ سەر ئیشەکەی. خونچە ڕووی کردە مەعسوومە و گوتی ئەوە باسی چیتان ئەکرد میوان و دەعوەتی چی؟ ئەحمەد بە خۆشییەوە هەڵی دایێ و گوتی ئەوە نییە گیانە پێت ئەڵێم کە ئەو خزمانەی خاڵۆژن ئەیانەوێت بێن بۆ لامان سەرمان بدەن، بە زەردەخەنەوە گوتی وابزانم خەریکی مناڵەکان بووی بۆیە گوێت لێ نەبوو کە چی ئەڵێم، سبەینێ جومعەیە و ئەیانەوێت بێن. خونچە ڕاپەڕیی و گوتی ئەوە چییە دیسان خەیاڵیان داوینەتێ خۆ ساڵێکیش ئەبێت من نەچوومەتە ماڵیان و چاوم بە چارەیان نەکەوتووە وەڵا تاقەتی کەسمان نییە. ئەحمەد بە زەردەخەنەیەکی ناچاری و ترسەوە گوتی وەڵا خۆ منیش هەر ماوە و کاتم نییە لەگەڵیان دانیشم بەڵام چار چییە لەبەر خاتری خاڵە خۆ دەریان ناکەین.

خونچە بە تووڕەبوونێکەوە کچەکەی دا بە شانیدا و هەستایە سەرپێ و گوتی ئینجا بۆ پێت نەگوتن کە خاڵە لێرە نییە ڕاوەستا تاکو دێتەوە. ئینجا کە ئەویش هاتەوە جارێکی تر بێنەوە سەرمان، بیست کەسن، مناڵەکانیان ئەڵێی ئەژدیهان، ماڵەکە سەرەوخوار ئەکەن یەک یاریی ساغ بۆ ئەو منالانەم ناهێڵن. مەعسوومە وەک ویستت ئاگرەکە بکوژێنێتەوە و ئەویش قسەیەک بکات گوتی وەڵا یەک شت ناهڵێم لە بەردەستیاندا بێت هەمووی ئەخەمە ژوورە بچکۆلەکەکەوە و دای ئەخەم، دەستی ڕاوەشاند و گوتی حەی حەی هیچ ناکەم ئەهێڵم دەست بۆ یاریی مناڵەکان بەرن. خونچە بە تەوسێکەوە گوتی خاڵە ماڵی عیزەدینیش دێن؟ ئەحمەد گوتی ئەرێوەڵا ئەوان تەلەفۆنیان کرد و گوتیان کەوا ماڵی ئامۆزاکەشیان دێن لەگەڵیان. خونچە بە جارێک هەڵچوو و گوتی بەسەری پێغەمبەر لە بەیانی زووەوە ئەڕۆمە دەرێ و لەم ماڵە نابم تاکو دێن و ئەڕۆنەوە. ئەحمەد خۆی گرت کە تووڕە نەبێت و هەر بە نەرمی قسەی لەگەڵ ئەکرد، مەعسوومە کە ترسابوو لە هەڵگیرساندنی شەڕ گوتی ئەیەڕۆ بۆ کوێ ئەچیت وەڵامنیش لەگەڵت دێم حەز ئەکەیت با بچین بۆ سلێمانی، خونچە گوتی زۆر چاکە ئەڵێم باوکم نەخۆش کەوت و بە پەلە چووین و مەیەن. خونچە دەستی گرتبوو بە پشتی مناڵەکەیەوە و بە ژوورەکەیدا پیاسەی ئەکرد و سوور هەڵگەڕابوو، لێوی ئەلەرزی و زۆر تووڕە بوو. ئەحمەدیش تووڕە و شپرزە بووبوو و نەیەزانی چی بکات. خونچە خۆی بەردایەوە سەر تاکێ کورسی کە لە ژوورەکەدا بوو و گوتی عیزەدین! ئەوە من ئەزانم بۆچی دیسان سەریان کردۆتەوە سەرمان، چاوت لێیە ئەوجارە کچە جرپنەکەیان چیی کرد و ڕووی کردە مەعسوومە و گوتی ئەی جاری پێشوو ڕەسمی ئاغای لە ئەلبوومەکە دەرنەهێنا و بردی بە بیانووی ئەوەوە کە ڕەسمی خاڵۆژنی تیایە! ئەحمەد ئیتر خۆی پێ نەگیرا تووڕە بوو و قیڕاندی و گوتی کەواتە بە قسەی تۆ ئەوە حەزیان لە من کردووە بۆیە دێن بۆ لامان. ئەحمەد

ئاوڕێکی لە مەعسوومە دا کە خەریک بوو بگرێت و زۆر ناڕەحەت بوو و گوتی کەواتە بۆ پێم نالێم کە ڕەسمیان بردووم و حەزیان لێ کردووم، ئەحمەد هەموو لەشی ئەلەرزی و دەستی بە ناڕەحەتی و تووڕەیی هەڵگلۆفت و ئەیگوت ئیتر لە تەحەملمدا نەما، زۆرم لێ قبووڵ کردی، ئیتر ئەوەم پێ هەڵناگیرێ و بارێکی زۆر قورسە، ئەچمە دەرێ حەزم لە خەڵک کرد، دێنە لامان حەزیان لێ کردووم، ئەجووڵێمەوە سەیری مینی جوب لەبەر ئەکەن، قیڕاندی و گوتی بەسە بەس ئەم حەزە سەگبابە بوو بەچی، خۆ ئەلەکتریکم پێ نییە خەڵک ڕاکێشم و هەموو و هەرچی هەیە حەزم لێ بکەن و حەزیان لێ بکەم.

ئەحمەد پەلاماری چاکەتەکەی دا و بە ماتییەکەوە گوتی خۆزگە وا بوایە خۆزگە بمتوانیایە بزانم چۆن وام ئەکرد بۆت، بەڵام ئاخ ئەوە ئەزانی هیچم پێ ناکرێت و ئەسیر و دیلی دەستی تۆم بۆیە تۆش وام لێ ئەکەیت، ئەحمەد ڕۆیشت و بە ڕێگاوە بۆینباخەکەی بەست و دەرگاکەی بە قایمی دایەوە بە یەکدا. خونچە ئاوڕی دایەوە حەوشەکە و لەگەڵ تەقەی دەرگاکە گوتی دەبڕۆ ملت بشکێ، چاوتان لەو دەمەی بوو، دایە هاڕەی گریان و کەوتە گلەیی لە بەختی خۆی کەچی بووە و چۆن بووە و ئێستا چیی لێ هاتووە. مەعسوومە دامابوو نەیدەزانی چی بکات و هەر هەڵپەهەڵپی بوو و ناڕەحەت و چاو بە فرمێسک بوو، لەبەر خۆیەوە ئەیگوت کچێ خەتای کەس نییە هەمووی خەتای شانس و بەخت و قوڕبەسەریی خۆمە، بچمە سەر سیروان وشکی ئەکەم ئەگینا ئێوە بە خۆرایی بۆ وا لە خۆتان ئەکەن، خوا نەیبڕێ لە چیتان کەمە، لە دڵی خۆیدا لۆمەی خونچەی ئەکرد و ئەیگوت دایکم ئەوە ئەو فەقیرە چیی کردووە چی ئیشێکی نابەجێی کردووە، واللە باللە غەدری لێ ئەکەی بە دینم قسەکانت هیچی ڕاست نین.

ماڵە کش و مات بوو ئەحمەد ئێوارە هاتەوە نانەکەی خوارد و هەندێ یاریی لەگەڵ مناڵەکان کرد و تۆزێ پاڵ کەوت و پشوویەکی دا،

هەروەها زۆریش چاوی لەگەڵ خونچە ئەگێڕا و زوو زوو لە ژێرەوە سـەیری ئەکـرد و دڵـی ئەدایە قسـەکانی کە چـی ئەڵێـت لەگەڵ مەعسوومە و هەندێ جاریش ئەیگوت ئەڵێی بچم دەست بکەمە ملی و ئاشتی بکەمەوە، لەپڕ ئەیگوت نەء ناچم بە ڕاستی ناخۆشی کردووە و سەری لێ شێواندووم نازانم چی بکەم و چۆن بجووڵێمەوە تاوەکو دڵێ ڕازی بکەم، بەڵام نەء منیش زۆر تووڕە بووم ئەبوو وا نەکەم و خۆم بگرم ئاخر ئەو فەقیرە گرێی هەیە نە ئەبوو بیرم بچێت، بەڵام بە ڕاستی زۆر بێئەقڵە ئەڵێی چاوی لە خۆی نییە و سەیری خۆی ناکات، عومری چی و ساڵی چی، سەری بادا و گوتی فایدەی چی نازانم بۆ تێناگات کە چەندم خۆش ئەوێت.

ڕۆژێ دوای شـەڕەکەیان میوانەکـان هـاتن، خـونچە بە ڕوویەکـی خۆشەوە چوو بەپیریانەوە و زۆر چاک خزمەتی کردن. مەعسوومە نان و چێشتێکی زۆر خۆش و چاکی بۆ لێنان هەر لە قبوڵی دانار دانارەوە تاکو بامیە خرپنە پڕ بە ماسولکەی جوان و یاپراخی سڵق و دەلـوبیبەر و پـڕ کەرەسـەی چـاک و دەعـوەتێکی بـۆ کـردن کە تـا ڕۆیشتنەوە هەر باسیان ئەکرد و مەتحیان ئەکرد. ئەگەرچی ئەحمەد هەنـدێ مـات و سـڵەمییەوە بەڵام زۆر لە خـۆی ئەکـرد کە بوێرێـت هەنـدێ بە باشـێ گوێیـان بـداتێ چـونکە لە خـونچە زۆر ترسـابوو و هەوڵێ ئەدا شتێکی زیاد لە پێویست نەکات لەبەر دڵـێ ئەو. خونچە لە دڵی خۆیدا بیری لە قسەکانی ئەکردەوە و ئەیگوت کوڕە بابە کچی چی، کچی بەسـەزمان ئەڵێی کەرتە دێوە مەمکی ئەڵێی مەسینەن بە سـنگیەوە، قوڕبەسـەرە چـاو و لـووتی پەنـا بە خـوا، سـپیی بێتـام و بەدقـوارە، بەو هەمـوو پـارەیەوە کە بـاوکی هەیەت ئێسـتەش کەس داوای نەکردووە و هەر شووی نەکردووە ئێستە ئەحمەدی فەقیر هیچ ناکـات ئاشـقی ئەمە ئەبێـت، بەخـوا منـیش خەیـاڵی سـەیر ئەکەمەوە ئەیەڕۆ ئەوە ئەو ئەحـمەدە فەقیـرەم بـۆ وا لـێ کـرد، ئەوە بـۆ هەنـدێ جـار ئینسـان وەک شـێتی لـێ دێت و هیچـی بیـر نامێنێت، ئەو کـوڕە

بەسەزمانە کە چەندین ساڵە ئەیناسم بەو حاڵەش بوو کە قسەی هەموو دونیا و دایک و باوکی گوێ نەدایە و منی نەگۆڕییەوە و وازی لێ نەهێنام و دوایی بووە بە باوکی ئەو چەند مناڵەم بەسەزمانە سەری هەموو سپی بووە و بووە بە کولووی سپی و ڕۆحی لەسەر سەری خۆم و مناڵەکانمدا کەچی من وای لێ ئەکەم وەڵا هەر ئێستە میوانەکان ڕۆیشتنەوە ئەچم دەست ئەکەمە ملی و ئاشتی ئەکەمەوە.

– نە دوایی وا ئەزانێت مەجبووریم. نەء نەء ئاشتی ناکەمەوە.

ڕۆژی دوایی بە نیوەڕۆ ئەحمەد هاتەوە ماڵێ و مناڵەکان چوون بە پیریەوە کە لە ماوەی ئەو دوو سێ ساڵی دواییدا خونچە مناڵی خۆیی گەیاندبووە چوار، دوو کوڕ، دوو کچ، کچە گەورەکە ناز زارا چوو خۆی هەڵدایە باوەشی باوکی. ئەحمەد کچەکەی ماچ کرد و گوتی ناز گیان بیری خاڵە ئەکەیت ئەویش بە پرۆشەوە گوتی ئەرێوەڵا ئەمە خاڵە کەی دێتەوە من زۆری بیری ئەکەم. ئەحمەد گوتی وەڵا سبەینێ ئێوارە و ڕووی کردە مەعسوومە و گوتی خاڵە دێتەوە لەگەڵ باوکم. مەعسوومە گوتی توخوا و یاخوا بەخێر بێتەوە وەڵا شەرتبێ شکاتتان لێ بکەم و پێی بڵێم ئەوەتی تۆ ڕۆیشتووی قسە لەگەڵ یەک ناکەن و دوای تۆ شەڕێکی خراپیشیان بوو.

ئەحمەد پێکەنیی و گوتی نە بۆ خاتری خوا، ئەو کە شاگردەکان شەڕ ئەکەن دوو شەو و دوو ڕۆژ نارەحەت ئەبێت ئینجا نەخوازە ئێمە، مەعسوومە دیسان لچی شۆڕ کرد و گریا و گوتی دە بە قەبری ئەو جوانەمەرگە ئێستە هەڵنەستن و دەست نەکەنە ملی یەک و ئاشت نەبنەوە هەموی بۆ ئەگێڕمەوە، بە گریانەوە چووە دەرێ و گوتی بەخوا هەر خاڵە هاتەوە منیش سەری خۆم هەڵدەگرم و لەم ماڵەدا نامێنم خۆم دڵم تەنگە تاقەتی ئەم قوڕبەسەرییەشم نییە. ئەحمەد وەکو لە خوای ویستبێ هەر ئەوەندەی پێ کرا ڕابپەڕێت و دوای مەعسوومەدا بڕوات و بڵێت ئا وەرە سەیرکە بزانە و ڕای کرد و پەلاماری خونچەی دا و دەستی کردە ملی و نە ماچیک و نە دوو ماچ

یەک لەسەر یەک وەکو شێت، خونچە هەر خۆی ڕائەپسکاند لە دەستی و پێئەکەنی و ئەیگوت ئەیەڕۆ ئەیەڕۆ ئەوە بۆ وا شێت بوویت.
ئەحمەدیش بەدەم ماچەوە ئەیگوت ئاخر مەعسوومە نارەحەتە و ئەڵێت ئەبێ ئاشت بنەوە دوایی شکاتمان لێ ئەکات لای خاڵە.
مەعسوومە چاوی خۆی سڕییەوە و دەستی کرد بە پێکەنین و دڵی خۆش بوو منداڵەکانیش قاوقریشیکیان تێکەوت و باوک و دایکیان تێر پێکەنین کەوا ئەو فەقیرانە لە کوێیان ئەزانی کەوا باوکیان وەخت بوو شێت بێت و قسەی مەعسوومەی فەقیری کرد بە بیانوو.
ئێوارە خاڵە و باوکی ئەحمەد و کچێکی جل کوردی ئێسک سووکی حەڤدە هەژدە ساڵە لەگەڵ ئەحمەد کردیان بە ماڵدا.
ئەمانیش بە گەرمی چوون بە پیریانەوە، خونچە پەلاماری خاڵە و خەزووری دا و دەستی ماچ کردن و دەستی کردە ملی کچەکە و بە گەرمی بەخێرهاتنی کرد و دانیشتن.
ئەحمەد گەشابووەوە و دڵی خۆش بوو ئەگەرچی لە دڵدا بەزەیی بە باوکیدا ئەهاتەوە چونکە زۆر پیس و سیس و چرووساوە هاتە بەرچاوی.
خونچە هەر بە چاوپێکەوتنی ئەو کچە لە دڵی خۆیدا کەوتە پرس و پرسیار و هەندێ شڵەژا ئەگەرچی نەیبردە سەر خۆی و بە گەرمی ئەهات و ئەچوو بە دەوریاندا و ڕووی خۆی بە تەواوی خۆش کردبوو، هەر زووش زانیی کە ئەمە برازای وەستا قادرە و لە هەڵەبجە ئەژیەت لەگەڵ دایک و براکانی و باوکیدا کە برا بچووکی وەستا قادر بووە و لە دەمێکەوە مردووە و ئەمانی بە هەتیوی بەجێ هێشتووە و هەروەها چەند جارێکیش گوێی لێ بووبوو کە ئەحمەد و خاڵە قسەیان ئەکرد و ئەیانگوت ئێرە باشە دکتۆری چاکی گورچیلە لێرە ئاشنایانە، لەبەر ئەوەیە کە هاتووە.
خونچە دیسان کێچ کەوتە کەوڵی و خەریک ئەبوو شتی خراپ بێت بە مێشکیدا.

- کـوا نەخۆشــی چــی هیچــی پێــوە دیــار نیــیە ســوورە ســووری ڕوومەتیەتی.
- کوێڕا و چ زوو ئەم کـچە وای لـێ هـات و وا گەورە بـوو هەمـووی چەنـد سـاڵ لەمەوپـێش کچێکـی دە سـاڵێ سـیس و پـیس بـوو لەویـا کەوتبوو، بڵێم چی خەڵک چەند حەز ئەکەن خۆیان فەقیر و بەسەزمان و بێگوناه نیشـان بدەن کە کچی چەندیشـیان پێیە لە ژێرەوە و چەند هاوەنتەچین، دە بڵێ پیرەمێرد ئەمەی بۆچی بوو، بۆچی دکتۆری بـاش لە سلێمانی دەست نەئەکەوت، خەستەخانەی لێ نییە؟
- من بزانم هێنـاویەتی بەشـکم ئەحـمەد بیبینێت و لای خەڵکیش بڵێت وەڵا زۆر بەتـەنـگ بـرازا هەتیوەکـانمەوەم، ئەوە نیـیە هێنـاومەتە سـەر دکتۆر و بە شاراندا ئەیگێڕم، لە ڕاستییشـدا بۆیە هێناویەتی کە خۆی فلسێکی تیا سـەر نەکات و فلسـێک نەکەوێت لەسـەری و هەمـووی بە کوڕەکەی بکات. وەڵا ئەوەش قەیناکا بۆ ئەوە نـاڵێم گونـاحە بەڵام ئەو ئەیەوێت بە تیرێ دوو نیشانە بشکێنێت و هەم ببێت بە چاکە بۆ خۆی و هەم کـوڕەکەی بیبینێـت، لە ئەحمەدیشــم زۆر بیســتووە کە چەنــد مەتحـی ئەو مـامەی ئەکرد و ئەیگـوت ئەگەرچـی بـرا بچـووکی بـاوکم بوو، بەڵام چاکیی زۆر زۆرە بەسەرمانەوە هەبوو.
دوای دوو ڕۆژ پیـرۆز بـرایە سـەر دکتـۆر و خەریکـی سـەیرکردن و تەحلیـل و ئەو نەوعە ئیشــانە بـوو. زۆری ئێـواران ئەحـمەد بـاوکی و ئامۆزاکەی بە ئوتومبیلی خۆی ئەبردە سەر دکتۆر و لەگەڵیـان ئەهـاتە ماڵەوە، هەروەها باوکی ئەحمەدیش تەگەرەی چاوی هەبوو.
ئێواران کە ئەگەڕانەوە ماڵەوە لەگەڵ خاڵە باس هەر باسـی ڕوونـتکەن و خوێن و دەمار و دەرمانخانەی پیرۆز بوو و باسـی چـاو و عەینەک و قەترەی چاوی وەستا قادر بوو.
خـونچە دیســان کەوتە خـۆی و بیـر و خەیـاڵی خراپـی لە مێشـکیدا کەڵەکە کـرد و سـەری دونیـای لـێ هـاتەوەیەک و لەم چـوونە سـەر دکتـۆر و دەرمـان و خەسـتەخانەیە کەوتە گۆمێکی بێبن و هەسـت و

خەیاڵێکی نابەجێ سەری لێ شێوان و کەوتە دوودڵییەوە و خەوی زڕا.

– ئەحمەد لەم ڕۆژانە زۆر ڕووی کراوەتەوە و زۆر بە گەرمی سەری زمانی و بنی زمانی باسی گورچیلە و عەمەلیاتە.

ئێوارەیەک کەڵەکە خەیاڵی نابەجێی خونچە هەرەسی هێنا کە وەختێ گوێی لێ بوو دکتۆر گوتبووی با کچەکە جارێ لەسەر ئەم دەرمانانە بەردەوام بێت و بەینێکی تر ئینجا جارێکی کە سەیری ئەکەینەوە کە ئایا عەمەلیاتی پێویستە یان نەء. وەستا قادر بڕیاری دا کە خۆی چەند ڕۆژێکی تر بگەڕێتەوە و دوایی دایکی پیرۆز بنێرێت کە ئەگەر پێویستی بە عەمەلیات بوو با ئەو بە دیارییەوە بێت و ئەگەر نەء تاکو بیباتەوە. خونچە کەوتە پرتەوبۆڵە لە کچە لە لای مەعسوومە و باسکردن و توانج تێگرتنی. مەعسوومەش زۆر دڵی بە کچەکە ئەسووتا و بەزەیی پیا ئەهاتەوە، بەڵام چاکیش لە ڕەوشت و خووی خونچە شارەزا بووبوو لەبەر ئەوە و بۆ ئەوەی لە بیرە خراپەکانی و ناڕەحەتییەکەی کەم بکاتەوە ئەو کەوتە دەربڕینی ناڕەزایی دەسکردی خۆی بەرامبەری لەبەر ئەوە هەرچەند خونچەی ئەبینی باسێکی ئەو کچەی بۆ ئەکرد ئەویش خێرا ئەیگوت کەوا کەرە و بێئەقڵە و پیس و پۆخڵە، جاری وا هەبوو ئەوەندە بە خراپە باسی ئەکرد خونچە پێی ئەگوت نە توخوا گوناحە چیی کردووە. زۆر جار مەعسوومە بە ناچاری و بە درۆی دەستکرد ئەیبۆڵاند و ئەیگوت ئۆ خوایە ئەمە چی بوو ئەم میوانە نەخۆشانە تاقەتی نەخۆشمان نییە یاخوا زوو بڕۆنەوە. خونچە پێئەکەنی و ئەیگوت دوعا بکە عەمەلیاتی نەوێت، بەمە خونچە سەری لێ شێوابوو جار ئەیگوت گوناح و جاریش لێی ئەبوو بە شەیتان.

ئێوارەیەک دیسان کوڕ و باوک و پیرۆز لە دکتۆر و فەحس و دەرمانکردن هاتنەوە، دوای شێو و نان چاو هەموو شتێک خواردن و خواردنەوە هەر کەس چووە سەر جێگا و ژووری خۆی.

ئەحمەد و خونچەش چوونە ژووری خۆیان، خونچە چوو کوڕە بچکۆلەکەی کە لە باوەشیدا نوستبوو بە ئەسپایی خستە جێگاکەیەوە و دواییش هات بەلای نوستنی خۆیەوە و خەریکی خۆ ڕووتکردنەوە و کەوا داکەندن بوو بۆ نوستن، ئەحمەد بە ئەسپایی هاتە لایەوە و سەری بردە نزیک ڕوومەت و لاملی و خەریک بوو ماچی کات، خونچە بەبێ قسە و لەبەر کوڕەکەی کە نوستبوو دەستێکی پێوە نا و بە ئەسپایی گوتی لاچۆ لاچۆ. ئەحمەدیش  بە دەنگێکی وەک چرپە گوتی بۆچی لاچم لاناچم و بە گەرمی پەلاماری خونچەی دا و گوشی بە خۆیەوە. ئەم جارە خونچە زۆر بە توندی خۆی ڕاپسکاند لە دەستی و گوتی وازم لێ بێنە تاقەتی تۆم نییە برۆ بەلای جرتوفرتی خۆتەوە. ئەحمەد سارد بووەوە و حەپەسا و لەسەر قەراغی جێگاکەی دانیشت و خۆشیی ڕاپەڕینەکەی دامردەوە و مات و مەلوول سەری داخست. خونچە لە جلگۆڕین بووەوە و هات بەلایدا تێپەڕیی و سەرکەوتە سەر جێگاکەی و لێفەکەی هەڵدا و چووە ناوی و پشتی کردە ئەحمەد. ئەحمەد بەینێک هەروەک خۆی مایەوە و هەروا بە دانیشتن و ماتی دوایی هەستا تۆزێ ئاوی خواردەوە و دەستێکی بە دەموچاوی خۆیدا هێنا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و ڕووی کردە خونچە و هەر وا بە دانیشتن و بە ئەسپایی گوتی تێمبگەیەنە جرتوفرت یەعنی چی چیم کردووە دیسان دەستت کردەوە بە قسە خۆشەکانت؟!

خونچە خۆی هەڵگێرایەوە سەر لایەکەی تر و ڕووی کردە ئەحمەد و گوتی ئەرێوەڵا قسەکانم هەر ئەکەم و لە خۆڕایی وا ناڵێم. ئەحمەد بە تووڕەبوونەوە پەلاماری لێفەکەی دا و لەسەری لابرد و گوتی دەی هەستە بە جوانی تێمبگەیەنە با دیسان نەیکەم بە هەرا و بەم شەوە حەیامان بچێت و باوکم و خاڵە بمرن لە داخاندا و مناڵەکانمان هەموو شێت بن. خونچە گوڕی دایە خۆی و بە تووڕەییەوە هەستا و دانیشت بەڵام چ دانیشتنێک لەبەر ڕووناکیی ئەو چرا کزە ئەتوت

حـۆری و خـوای جـوانییه و بەو سـەروپرچە ڕووتەوە و بەو کراسـە بنەوشــە تیــرەی لەبەریــدا بــوو و ئەو لامــل و گەردن و ڕوومەت و لەشـــولارە هەر شـــەوقی ئەدایەوە و ئەتگــوت هەر خـــۆی چـــرا و ڕووناکیی ژوورەکەیە.
ئەحـمەدی فەقیـر هەر ئەوەنـدەی پـێ کـرا بە چـاوێکی پـڕ حەسـرەت سـەیرێکی بکـات و بڵێت توخـوا تۆ لە خـوا ئەترسـی؟ توخـوا تۆ خـوا ئەناسیت؟ خونچە گوتی چاکی ئەناسم و زۆریش لێی ئەترسم چی تر ئەفەرمـووی؟ ئەحـمەد بە مەلـوولی و بە دڵێکـی شـکاو و لەسـەرخۆ گوتی جرتوفرتەکەم چییە حەز ئەکەم بزانم! خونچە دەستی ڕاوەشـاند و بە چـرپە گـوتی ئەو کـچە بـۆچی واتـان ڕێـک خسـت کەو ئەو لێـرە بمێنێتەوە و باوکت بە تەنیا بگەڕێتەوە سبەینێ؟ ئەحـمەد هەروەک لە بـانێکی بەردەیـتە خـوارەوە و بە حەپەسـاوی گـوتی باسـی بـاوکم و پیرۆز ئەکەیت و یەک چەپۆکی قایمی مـاڵی بە نـاوچەوانی خۆیـدا و بە چرپە گوتی ئەی هـاوار کچـی مـاممە و هەتیوە، قوڕبەسـەرە ئەوەتەی هاتووە ڕەنگە چوار جار قسـەم لەگەڵ نەکردبێ خەیاڵت چووە سـەر ئەو نەگبەتەش؟!
ئەحـمەد زۆر لەسـەرخۆ قسـەی ئەکـرد و بەو حاڵەشـەوە نەیدەویسـت دۆ و دۆشاو تێکەڵ بکات و ئەهلـی مـاڵەکە و منـاڵەکـان شـێت بکات لە خەودا.
خـونچە گـوتی بـۆ لە سـلێمانی دکتـۆر و دەرمـان و خەسـتەخانەی لـێ نەبوو باوکت بە فێڵ هێناویێتی، سەری ڕاوەشاند و گوتی ئێ بەشـکم... ئەحمەد بۆی تەواو کرد و گوتی ئێ بەشکم من کچەکە ببینم و بە دڵـم بێـت و بیهێـنم، چـونکە نە ژنــی جـوانم هەیە و نە منــاڵم هەیە پەکـم کەوتووە، بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە خەم و ئـازارەوە بە بێزاری گـوتی کچـێ گوناهـت ئەگـاتێ، ئـاخر تـۆ بـڕۆ سـەیری خـۆت بکە و سـەیری خەڵکی تر بکە، کچی بەخوا عەیبە ئەم جۆرە بیرانە دێنێ بە خەیاڵتدا، کچی من ئێستە لە دوای چوار منـاڵ هێشـتا هەر بـاوەڕ نـاکەم کە تـۆم

هەیت و زۆر چاک ئەزانی کە چەندم خۆش ئەوێیت و بۆیەش ئەم دونیایەم خۆش ئەوێت چونکە تۆی تیای. ئەحمەد مات بوو و سەری داخست و فرمێسک کەوتە ناو ڕیشی تاشراوی و لەسەر دەنگی لێدانی دەرگای حەوشە ڕاپەڕیی کە زۆر بە قایمی لێیان ئەدا. ئەحمەد بە شپرزەییەکەوە دەرپەڕییە دەرێ و گوتی ئێ ئێ کێیە ئەوە کێیە؟ سەعات لە دوازدە تێپەڕی کردبوو خونچە دڵی داخورپا و هەستا و لەسەر جێگاکەی هاتە خوارەوە و پەلاماری کەوا و سەرپۆشەکەی دا. تا ئەحمەد ڕای کردە بەردەرگا خاڵە و باوکی دەرگایان کردبووەوە چونکە ژووری ئەوان نزیکتر بوو، ئەحمەدیش گەیشت، یەکێکیان لێ هاتە پێشەوە و گوتی ئەمەیە ماڵی ئەحمەد قادر مودیری ئوتێل مستەفا، ئەحمەد تفەکەی قوت دا و گوتی بەڵێ منم ئەحمەد قادر. پیاوەکە گوتی ئەبێ بێیت لەگەڵمان. ئەحمەد گوتی چییە خێرە؟!
پیاوەکە گوتی خێراکە ئەمرمان پێیە، یەکێکی تر لەولاوە قیڕاندی و گوتی ئەملا و ئەولای ناوێت وەرە ئێستە ئەزانی چییە. ئەحمەد سەرێکی کێشا و چووە پێشەوە کە سەیر ئەکات بەردەرگا و سەری کۆڵان پڕە لە موسەلەحەی پۆلیس و هەر سەرە لێی هاتە پێشەوە و ئەمانەش هەموو ئەمن و پۆلیسن. ئەحمەد شڵەژا و گوتی با جلەکانم لەبەر بکەم، دەرگا کرایەوە و هەموو دارژانە حەوشەکەوە. وەستا قادر هەر دەمودەست ئەژنۆی شکا و زمانی بەسترا و هەڵلەرزی و گرمۆڵە بوو و کەوتە ئەولایەوە. خاڵە کڵاوەکەی کردە سەر و چاکەتەکەی بە پەلە لەبەر کرد و بە شپرزەییەوە گوتی ئەمە چییە ئەمە چییە و چووە پێشەوە لە پۆلیس و ئەمنەکان و بە تووڕەییەوە گوتی حەی حەی وەڵا کەم هاتوون، ئەمە بە خێرێ کێ چیی کردووە؟ پیاوێکمان کوشتووە و چەند کەسمان ڕووت کردۆتەوە، ماڵی قاچاخمان بردووە، عەیب نییە شەرم نییە بەم نیوەشەوە ماڵ و منداڵی خەڵکی ئەتۆقێنن؟ ویستی هێشتا قسە بکات کە ئەحمەد بە پەلە گەیشتە لایان و پێشیان کەوت و چوو سواری ئوتومبیلی ئەوان بوو،

به هەزار پاڕانەوە خاڵەشیان سوار کرد لەگەڵی. خونچە بە جارێک وشک بوو و قسەی نەما و لێوی سپی بوو و چاوی زەق بوو. مەعسوومە لە ژوورەکە پرچی خۆی بەسەر خۆیەوە نەهێشت.
پیرۆز بە چەپۆک بەربووە سەر و دەموچاوی خۆی و بە دەستێکیش خەریکی مامی بوو کە وەکو نیوەمردوو لەو ناوە کەوتبوو، منداڵ بە زریک و هووڕەوە هەموو ڕاپەڕین لە خەو.
ئەحمەدیان پێش خۆیان دا لەگەڵ خاڵە مچە و بردیانن بۆ ئوتێل، ئوتێل دەوروبەری هەمووی بە پۆلیس گیرابوو. شاگرد شپرزە بووبوون، هەندێکیان تۆقیبوون و بۆ دەرفەتێک ئەگەڕان کە ڕاکەن، ڕۆستەم و حەسەن بە کەلەپچە بەدیار چەند پۆلیسێکەوە دانرابوون، مشتەری هەمووی ڕۆحیان چووبوو و داما بوون و هەندێ هەر خەبەریشیان نەبووبووەوە و هەندێ لە ترساندا هەر کە چاویان بە ئوتومبیلی پۆلیس کەوتبوو ڕایان کردبوو و نەگەڕابوونەوە.
ئەحمەدیان پێش خۆیان دا و بردیانە ژووری ڕۆستەم سەیر ئەکەن هەرچی شتی ئەو ژوورە هەیە بەسەریەکدا هەڵدراوەتەوە و هەمووی پەرشوبڵاو کراونەتەوە. تایپ و چەند بەستە کاغەزیش لەسەر مێزێک لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دانراوە. ئەحمەد و خاڵە حەپەسان و دڵیان کەوتە پەلەپەل. قۆمیسەرێک لە ئەحمەد چووە پێشەوە و گوتی ئەمانە هەمووی هیی تۆن و لە ئوتێلی تۆدا تایپ کراون و چاپ کراون، ئەمانە هەمووی نەشرە و بەیانی شیوعین، دە فەرموو پێش کەوە بۆ دائیرەی ئەمن.
ئەحمەد بە حەپەساوی گوتی تایپی چی و نەشرەی شیوعیی چی و منی چێ! تاکو ئەحمەد قسەکەی تەواو کرد پاڵێکیان پێوە نا و پەلیان ڕاکێشا بۆ لای ئوتومبیلەکان.
ڕۆستەم کە تووڕە و زۆر هەڵەشە بوو دوو سێ بۆڵەبۆڵ کرد و خەریک بوو خۆی ڕاپسکێنێت لە دەستیان و جنێو بدات، ئەویشیان بە دوو سێ شەق خستە ناو ئوتومبیلەکەوە و بردیانن و ڕۆیشتن.

خاڵە گەڕایەوە ماڵێ ئەو شەوە تاکو بەیانی کەس خەو نەچووە چاوی و تا ڕۆژ بۆخۆیان دانیشتن.

خاڵە بەیانی شەوەکەی چووە دەرێ لە ماڵ و کەوتە هانابردن بۆ ناسیا و ئاشناکانی کە یەکجار زۆر بوون و کەوتە سۆراغ پرسین و ئەملا و ئەولا. ئەحمەد و دوو کوڕەکە بەیانی زوو ڕەوانی بەغدا کرابوون. پاش هەوڵ و تەقەلای خاڵە و مەراقێکی زۆر کوشندە و گەڕانێکی چەند ڕۆژی زانرا کە لە کوێن براون بۆ لێکۆڵینەوەی جینائی، دوای مانگێکی تر ڕەوانەی حەپسخانە کران و قەرار درا کە بدرێن بە مەحکەمە. خاڵە لە ماوەی ئەو مانگەدا چار جار چووە بەغدا و گەڕایەوە چونکە جێی بە خۆی نەئەگرت و سەری دونیای لێ هاتەوە یەک.

وەستا قادر ڕۆژی چەند جار دکتۆری ئەهاتە سەر و حاڵی زۆر خرا بوو، دایکی ئەحمەد و پووری و کەسی خونچە و دایعە ڕەعنا هەموو بە خۆکوشتن هاتن بزانن کە چییە.

ئوتێل چۆڵوهۆڵ بوو و کەس نەیەوێرا بێت بەلایەوە، ئیشکەرە پیرەکە کە ناوی کاک خدر بوو لەگەڵ دوو کوڕی تری ئیشکەر کە بەغیرەت بوون و نەترسان و گوتیان ئوتێلەکە بەڕەڵا ناکەین و هەر بە جوانی ڕای ئەگرین و چی ئەبێت با ببێت.

کاک خدر و دوو کوڕەکەی تر لە ناو خۆیاندا قسەیان ئەکرد و ئەیانگوت ئەم سەگبابەنە درۆ ئەکەن تایپی چی و نەشرەی چی بەخوا خۆیان ئەم نەشرانەیان هێنا و لەسەر ئەم مێزەیان دانا.

کوڕەکەی تر گوتی نازانم ئەو تایپە کۆنە شڕەیان لە کوێ دەرهێنا ئێمە کەی هەر تایپمان هەبووە کاک خدر لە هەردووکیان بەتەمەنتر بوو لەپڕ ڕاپەڕی و گوتی وەڵا دۆزیمەوە ئێستە زانیم ئەو تایپە چییە، دوو کوڕەکە بە گوێدانەوە پرسیان و گوتیان تۆ ئەزانی ئەم تایپەیان لە کوێ پەیدا کرد؟ کاک خدر گوتی ئەوە ئەو تاییپ کۆنە شڕەیە کە ئەو جارە ئەرزوحاڵچییەکە هێنای و شەوێ لە ژووری خوارەوە بوو

و بەیانی گوتی خێرتان ئەگات بزانن بەشکم پیتاکێکم بۆ بکەن و ئەم تایپە شکاوەم بۆ چاک بکەنەوە و پەکم کەوتووە و شەش هەتیوی خوشکم کەوتووە بەسەردا لەگەڵ چوار منداڵی خۆم، دوانزە سەرخێزانی ئەم پارچە ئاسنە بەخێویان ئەکات. کاک ئەحمەد و خاڵە پێی پێکەنین و گوتیان ئینجا کاکە ئەمە چیی پێوە ماوە تاکو چاکی کەیتەوە و ئەوە بوو خاڵە و کاک ئەحمەد و یەک دوو هاوڕێی خاڵە پیتاکیان بۆ کرد و تایپێکی نیوداشی تریان بۆ کڕی و بردی و ڕۆیی و ئەمەی لێرە بەجێ هێشت هەر بیریشمان نییە کە لە کوێیان فڕێ دابوو. کوڕە منداڵکارەکە پێکەنیی و گوتی وەڵا کاک ڕۆستەم گوتی ئەوەندە کۆن و سواوە فڕێی نادەم ئەینێرم بۆ شوێنی عەنتیکەخانە.
زۆر جار ئەو سێ کەسە کە بەدیار ئوتێلەکەوە بوون قسەیان بە خەڵکی ترسنۆک ئەگوت کەوا چۆن لە ترساندا ئێستە ئەم ئوتێلە وا چۆڵ و بەتاڵ بووە و جاران چۆن بەرنەئەکەوت. ئەوی تریان ئەیگوت کورە کاکە ناهەقیان مەگرە ئەوەتا بوختان و درۆی وا بۆ خەڵک دروست ئەکەن خەڵکیش ئەترسن. کاک خدریش ئەیگوت ئاخر ئەگەر خەڵکیش ئەوەندە ترسنۆک نەبن و ئەوەندە سەریان بۆ شۆڕ نەکەن ئەوانیش وا ناکان و هەندێ سڵ ئەکەن. ئەوی تر ئەیگوت کورە بەخوا هەقە هەموو ڕۆژێک جاسووس و ئەمنێک بتۆپێنن چونکە ئەمە هەمووی خەتای ئەوانە، ئاخۆ کام سەگبابیان خەبەری لە کاک ئەحمەد داوە، ئەگینا کاک ئەحمەدی فەقیر و تایپ و ڕۆستەم و نەشرە، جارێ ڕۆستەم هەر حەزی لە سیاسەت نییە، کاک حەسەنیش هەر نازانێ شیوعی یەعنی چی. ئێستە ئەمەیان کردووە بە بیانوو لە خەڵک، دە وەرە نەعلەت لە باوکی هەرە چاکیان مەکە.
لە دوای شەش حەوت مانگێکی پڕ هەوڵ و تەقەلای خاڵە و چەندەها تووڕەکە ماست و پێستە پەنیر و هیزە ڕۆژن و بەرتیل دا لەگەڵ هەنگوینی نایاب و چاک ئینجا زانیی کە شوێنی حەپسخانەی ئەحمەد و دوو کوڕەکە لە کوێیە و مەحکەمەیان کەیە لەگەڵ هەردوو کوڕەکە.

خاڵە یەک دوو محامیی بەناوبانگ و باشی بۆ ئەحمەد و دوو کوڕەکە گرت و چاوەڕێی ڕۆژی مەحکەمە بوو.
خونچە بەجارێک هەرەسی هێنابوو هەر ئەوەی پێ ئەکرا کە بچێتە ژووری خۆیان و جل و کەلوپەلی ئەحمەد بگرێتە باوەش و بۆنیان بکات و ماچیان بکات و بگری و داوا لە خوای بکات و بڵێت هەی ئاگرم تێبەربێت، هەر ڕووم ڕەش بێت، ئەوە بۆ وام لێ کردی، بۆ وازم لێ نەهێنای، تۆ کەی وابووی، تۆ هەمیشە پیاو و کوڕی باش بوویت و زۆر نەجیب و بەحورمەت بوویت، ئەوە کەی حەزت لە خەڵک کردەووە، چەندت خۆش ئەویستم منیش چەندم غەدر لێ کردی. خونچە گریانی بەرز ئەبووەوە و ئەیگوت ئۆ خوایە تۆبە، خوایە ڕووم ڕەشە، خوایە لەبەر منت نەبێت لەبەر خاتری ئەو باوکە پیرە و ئەو پیرەمێردە سەرلێشێواوە و ئەو منداڵانەی ڕزگاری بکەیت لە دەست ئەو زاڵمانە.
خونچە بە کوڵ فرمێسکی ئەهاتە خوارەوە وەک پلوسکی بەسەر ڕوومەتەکانیدا و لە دڵی خۆیدا ئەیگوت ئەو شەوەی کە گیرا چەند بە دڵ و بە کوڵ هاتی و پەلامارت دام و ئەتویست بۆنم بکەیت، چۆن پاڵم پێوە نای و تەریقم کردیتەوە هەی دەستم شکێ و دەستم هەڵوەرێ ئاخر بۆ بۆ وام لێ کردی؟ ڕۆژێک مەعسوومە چووە بازاڕ و هاتەوە و گوتی ئەرێ خەڵکینە زۆر دەمێکە هەستی چەند زەلامێکی سەرسەری و خوێڕی ئەکەم لەم دەوروپشتی ماڵەمان دێن و ئەچن ئەبێ ئەمانە چ بن! دراوسێکانیشمان هەروا ئەڵێن. خونچە گوتی بە خوا ڕەنگە ئەمن و جاسووس بن و چاودێریی ماڵەکەمان بکەن بۆ ئەوەی بزانن چی ئەکەین و چی ناکەین. مەعسوومە دەستی کێشا بە سنگی خۆیدا و گوتی ئاخ خۆزگە ئەمزانی دەمانچە چۆن ئەتەقێنن بزانە چۆن ئەمکرد بە قوربانی دوو گوللەی چەند فلس بایی، دە چاویان دەرئەهات با هەر لەبەر ئەو بارانە بن بزانم چییان دەست ئەکەوێت.

ڕۆژی مەحکەمە هات خاڵە لە سەعات حەوتەوە چووە بەردەرگەی مەحکەمە، هەرچەند پێیان گوت خاڵە گیان وانابێت هێشتا زۆر زووە بەڵام ئەو گوتی قەیناکا وام پێ خۆشە.

ئاخری مەحەکەم دەستی پێ کرد و تاوانی ئەحمەد و ڕۆستەم و حەسەن ڕیز کران و بە ناوی حکومەتەوە بە دەیان توهمەتی درۆیان بۆ دروست کرا. ئەمانیش بێ دەسەڵات هەر گوێیان ئەگرت و سەریان ڕائەوەشاند هەندێ جار درۆ و توهمەکان ئەوەندە گەورە بوون هەرسێکیان دەستیان ئەکرد بە پێکەنین، ڕۆستەمە کەللەڕەق زوو زوو خەریک ئەبوو قسە بکات و بڵێت وەڵا درۆ ئەکەن و وا نییە بەڵام زوو ئەحمەد سیخورمێکی لێ ئەدا کە بێدەنگ بە و ورتەت لە دەمەوە دەرنەچێت. دوایی نۆرەی محامیی ئەحمەد و ئەوان هات و کەوتنە قسە و لەسەریان کردنەوە، دوایی ئەحمەد هاوڕێکانیشی بە نۆرە قسەیان کرد و باسی تایپەکەیان گێڕایەوە کە چۆن بووە و خاوەنی کێیە و ئەتوانن لێی بپرسن. بەختی ئەحمەد و کوڕەکان حاکمەکە کابرایەک زۆر باش و لەسەر هەق بوو و چەندین جار لەسەر ئیشی وا ناڕەوا بە قسەی حکومەت و پۆلیس و دائیرەی ئەمنی نەکردووە و خەڵکەکەی بەرەڵا کردبوو، چەند جارێکیش لە وەزیرەکەی و حکومەتەوە هەڕەشەی بۆ هاتبوو کە پشتی ناحەزەکانی حکومەت ئەگرێت بەڵام ئەو هەر گوێی نەئەدانێ و دوو سێ جاریش خەریک بوو واز بێنێت لەسەر ئەم قسەوباسانەی حکومەت. لەدوای چاوەڕوانییەکی پڕ پەرۆشی و مەراق و دڵەکوتێ مەحکەمە حوکمی دا بە بەربوونی ئەحمەد و هەردوو هاوڕێکانی، خاڵە دەستی کرد بە چەپڵەلێدان و بژی بژی کرد بۆ پیاوی ڕاست و لەسەر هەق و بەویژدان و حوکمی ڕاست. تەلەفۆن کرا بۆ کەرکووک خونچە و دایک و باوکی ئەحمەد و مەعسوومە و پیرۆز قاوقریشکی خۆشیان تێکەوت، خزم و ناسیاو دارژانە ماڵەکەیانەوە. خاڵە و ئەحمەد و هاوڕێکانی هەر زوو لە خۆشییاندا کەوتنە ڕێ بەرەو کەرکووک، خاڵە

ئەم جارە لە خۆشییاندا زمانی بەسترابوو قسەی نەمابوو و هەر بە بێدەنگی دەستی بە ڕیشی خۆیدا ئەهێنا و ئەیگوت یارەبی هەزار جار شوکر. هەرچەند لە ڕێگا ئەحمەد ئەیدوان کە قسەیەک بکات ئەو هەر ئەیگوت جارێ بێدەنگ بن و هیچ مەڵێن تاکو ئەگەینەوە جێی خۆمان بە سەلامەتی.

خاڵە و کوڕەکان گەیشتنە کەرکووک. ڕۆستەم و حەسەن لە ئوتێل دابەزین کەسوکاریان هاتبوون لەوێ چاوەڕێیان ئەکردن.

خاڵە و ئەحمەدیش چوونە ماڵی خۆیان. ئەحمەد لاواز بووبوو و ڕەنگی زەرد و پەڕیو بوو و سپی هەڵگەڕابوو ئەتگوت لە نەخۆشی هەستاوەتەوە. دایکی کێشای بە سنگی خۆیدا و گوتی ئۆ دایکت بمرێ ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟ ئەویش باوەشی کرد بە دایکیدا و گوتی هیچ نییە ئەوە مەراقیم بوو بۆیە وام لێ هاتووە. بەڵام لە ڕاستیدا چونکە لە وەختی پرس و لێکۆڵینەوەدا لێیان دابوو و ئەزیەتیان دابوو. هەروەها کوڕەکان دەست و قاچیان دوو سێ جێ برینی وەکو نیشانەی بێویژدانی و دڕەندەییان پێوە مابوو، ئەوانیش هەرچەند چاویان بەو جێبرینانە کەوت لە دڵی خۆیاندا ئەیانگوت ئێ ڕاوەستن خۆ لەسەر خۆڕایی واتان لێ کردین شەرت بێ لەمەودوا بە ڕاستی دەست پێ بکەین و هەقتان لێ بکەینەوە و قەت ئیتر کۆڵ نەدەین.

شەو درەنگ هەر کەسەو چووە ژووری خۆی و خونچە لە دوورەوە باوەشی بۆ ئەحمەد کردەوە و پەلاماری دا و ئەحمەدیش باوەشی پیا کرد و بەبێ قسە دەمیان خستە ناو دەمی یەک، خونچە دەمی لا برد و بەدەم هەنسکەوە گوتی وای ماڵیان کاول بێت چ بوختانێکیان پێ کردی.

ئەحمەدیش بە زەردەخەنەیەکی خۆشەوە و بە چاوێکی پڕ لە گلەیی سەیرێکی کرد و گوتی ئینجا هەر ئەوان بوختانیان پێ کردن ئەی ئەو خەڵکانەی تر و جارێکی تر پەلاماری یەکیان دا و دەمیان نایە ناو دەمی یەکەوە.